خوای گەورە یەکەلای دەکاتەوە لە نێوان ئێوەو محمدا ئەنجا ڕۆیشتن .....) [٢٤٧].

وە هەروەها ئیبن عەباس (رضي الله عنه)دەفەرموێت سورەتی :﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ۝٢ ﴾ (ص: ١ - ٢) سەبارەت بەو کۆڕو کۆمەڵە لە کاتی سەرەمەرگی ئەبوطالب دا هاتە خوار کە ئەبو جەهل و کۆمەڵەکەی بەرپەرچی پێغەمبەر (ﷺ) یان دایەوە ...)[٢٤٨]

## مردنی أبوطالب

ئەبو طالب یەکێك بوو لە هەرە دڵسۆزانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە بەردەوام پەنای پێغەمبەری (ﷺ) دەدا و پارێزگاری لێ دەکرد و بە هەموو جۆرێك پشت و پەنای دەگرت، بەڵام ئەبو طالب سەر ڕای ئەم هەمووە باوەڕی بە پەیامی پێغەمبەری (ﷺ) نەبوو وە بە هیچ جۆرێکیش دژایەتی پێغەمبەری (ﷺ) نەدەکرد و بە درۆشی نە دەخستەوە بەڵکو لە هەموو جێ یەك، باسی خۆی و هاوەڵانی وە ئاینەکەشی بە چاکە دەکرد بەڵام بێ باوەڕ بوو...

لە (حەبەی عەرنی) یەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت: (ئیمامی عەلیم بینی لەسەر مینبەر پێدەکەنی جارێکیان ئەوەندە پێکەنی کە قەت نەمدیوە ئەوەندە پێ بکەنێت

---

(٢٤٧) أخرجه: أحمد (١/٢٧٧) و في (٢/٣٦٢) رقم (٢٠٠٨ ، ٣٤١٩) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده ضعيف، و الطبري في (التفسير) ( ٢٣/٧٩)، و أبو يعلى (٢٥٨٣)، و الترمذي (٣٢٣٢) و قال حديث حسن صحيح، و النسائي في (الكبرى) ( ٨٧٦٩ ، ١١٤٣٦ ، ١١٤٣٧) و في (التفسير ) (٤٥٦) و قال محققه: حسن، و ابن أبي شيبة (٣/٣٥٩) و في (١٤/٢٩٩)، و ابن حبان في (موارد) ( ١٧٥٧) و قال محققه الأرناؤوط: ضعيف ، و البيهقي في (الكبرى) ( ٩/١٨٨)، و الحاكم (٢/٤٣٢) و صححه و وافقه الذهبي و قال أحمد شاكر في المسند (٢٠٠٨): إسناده صحيح، و ابن هشام ( ١/٢٧ ) (٢٩٧) عن ابن إسحاق و قال محققاه: إسناده فيه مبهم ) ، و المبهم من إسناد ابن هشام عن ابن عباس بن عبدالله بن معبد عن أبيه عن ابن عباس كما في رواية الحاكم الذي سيأتي قريباً مع رواية النسائي في (التفسير ) ( ٤٥٧) و اللفظ لابن هشام.

(٢٤٨) أخرجه: الحاكم (٢/٤٣٢) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) ( ٢/٣٤٦) و قال محقق (تفسير النسائي ) (٤٥٦): إسناده حسن، وقال محققا (سيرة ابن هشام )(٢٩٧): إسناده جيد.

ئەوەندەپێکەنی تادانەکانی دەرکەوت، فەرمووی : قسەیەکی ئەبوطالبم بیرکەوتەوە جارێك من و پێغەمبەر (ﷺ) لە (بطن النخلة) نوێژمان دەکرد هات بەرووماندا وبینی چۆن نوێژ دەکەین و چی دەڵێین وە دوای تەواوبوونی نوێژەکەمان پرسیاری لێکردین ووتی: ئەوە چی دەکەیت ئەی برازاکەم ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی کرد بۆلای ئیسلام ، وەئیسلامی پێ ڕاگەیاند، ئەبو طالب ووتی: ئەمەی ئێوە دەیکەن خراپ نی یە ئەوەیشی دەیڵێن هەر خراپ نی یە ، بەڵام وەڵاهی هەرگیزاو هەرگیز دوامەوە بەرز نابێتەوە بەسەرسەرم دا، ئەفەرموێت: لەو قسەیەی ئەبوطالب بوو کە زۆر پێکەنیم هات سەیرم لێ دەهات کە ئەو قسەیەی کرد)[٢٤٩].

پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەمەرگی ئەبو طالیبدا زۆر بەدڵسۆزانە داوای لێکرد بۆ ئەوەی شایەتمان بهێنێت و بەر شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت و بە بەهەشت شاد بێت، بەڵام هەر باوەڕی نەهێنا .... ئەم بەسەر هاتەش موسەیەبی کوڕی حەزن(ﷺ) دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (( لەکاتی سەرەمەرگی ئەبو طالب دا پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای و بینی ئەبوجەهلی لایە لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی موغیرە، پێغەمبەر (ﷺ)پێی فەرموو:

((یا عم انك اعظمهم علی حقاً و احسنهم عندی یداً و لأنت اعظم حقاً علی من والدي قل :لااله الا الله اشهد لك بها عند الله (فی روایة الحاکم) فقل کلمة تجب لك علی بها الشفاعة یوم القیامة قل : لا اله الا الله)).

واتە: ئەی مامە تۆ لە هەموو کەس زیاتر مافت بەسەر منەوە و هەیە لە هەموویان چاکتر بووی بۆم تۆ زیاتر لە دایك و باوکم مافت هەیە بە سەرمەوە بڵێ (لا اله الا الله) ئەو ووشەیە بڵێ تا تکاکردن بۆت لە سەرم پێ ویست بێت، ئەبو جەهل و عەبدوڵا ڕوویان کردە ئەبو طالب و پێیان ووت: ئەی ئەبو طالب ئایا دەتەوێت واز لە ئاینی (عبد المطلب) بێنیت، پێغەمبەریش (ﷺ) بەردەوام ئەم ووشەیەی دەدا بە گوێی دا، و ئەوانیش بەردەوام ئەو ووشەیەی خۆیان دەدایەوە بە گوێی دا تا دوا ووشەی ئەبو طالب ئەوە بوو کە ووشەکەی

---

[٢٤٩] أخرجه: أحمد (٩٩/١) (٧٧٦) وقال محققه : اسناده ضعيف ، و أبو يعلى (٤٤٧)، و البزار (٧٥١) ، والطيالسي (١٨٨) ، قال الهيثمي في (المجمع) (١٠٢/٩): رواه الطبراني في الأوسط و إسناده حسن.

ئەوانی دووبارە کردەوە ) [٢٥٠].

لەڕیوایەتێکی تردا : (ئەبو طالب ووتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە قورەیش بیکەن بە عەیبە بۆم وبڵێن :لەترسی مردن ئەو ووشەیەی ووتوە ئەگینا لەبەر دڵی تۆ دەم ووت: بەڵام (انا علی ملة عبد المطلب) واتە: من لەسەر ئاینی (عبدالمطلب)م ئەوە بوو مردوو ڕازی نەبوو کە بڵێ (لااله الا الله) و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((اما والله لاستغفرن لك مالم انه عنك)) واتە: بەڵام وەڵاهی داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەم تا خوا ئەو کارەم لێ قەدەغە دەکات و ڕێگەم پێ نادات ) [٢٥١].

لەڕیوایەتێك دا ئەفەرموێت: (پێ ی ووت: خوا لێت خۆش بێت بەردەوام داوای لێ خۆش بوونت بۆ دەکەم لای خوا تا خوا نەهیم لێ دەکات .موسوڵمانانیش کەوتنە داوای لێ خۆش بوون بۆ مردوانیان کە بەموشریکی مردبوون ) [٢٥٢].

ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾ (التوبة: ١١٣-١١٤) خوای گەورە ڕونی کردەوە کە هەرگیزاو هەرگیز بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و بۆ خاوەن باوەڕان نی یە داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ هاوبەش پەیدا کاران، ئەگەر خزمانیشیان بن دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کەئەوانە ئەهلی دۆزەخن وە ئەفەرموێت : ئایەتەش سەبارەت بە ئەبوطالیب دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ (القصص: ٥٦) .

---

[٢٥٠] أخرجه: البخاري (١٣١٠، ٣١٦٠ ، ٣٨٨٤،٤٧٧٢ )، و مسلم (٢٤)، و النسائي (٤/٩٠) (٢٠٣٤)، و أحمد (٥/٤٣٣) ، و الحاكم (٢/٣٣٦) و صححه و وافقه الذهبي، و البيهقي في (الدلائل) ( ٢/ ٣٤٢)، و الطبراني في (الكبير) (٢٠/٢٨٨).

[٢٥١] أخرجه: أحمد (٢/٣٣٤) (٩٦١٠) وقال محققه :اسناده صحيح على شرط مسلم ، و الترمذي (٣١٨٨)، و ابن حبان (٦٢٧٠) و قال محققه: صحيح، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٥٤٨).

[٢٥٢] أخرجه: الحاكم (٢/٣٣٥) و صححه و وافقه الذهبي .

ئەبو طالب بەم شێوەیە مرد و شایەتمانیشی نەهێنا بەتاك و تەنهایی خوا، ئەبو طالب دەبێ دوای مردنـی کـێ بیـشارێتەوە،چونکە تـەنها ئیمـامی عـەلی لێرەیـە و جەعفـەری بـرای لـە حەبەشەیە.

ئیمامی عەلی (ﷺ) خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:(کاتێ ئەبو طالب مـرد هـاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وپـێم ووت: مامـە پـیرە گومڕاکـەت مـرد کـێ بیـشارێتەوە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی (بڕۆ بیشارەوەو هیچ مەکە تـا دێیتـەوە بـۆلام . منـیش ووتم : لەسـەر هاوتـا بڕیاردان مردووە؟ فەرمووی : بڕۆ بیشارەوە، ئنجا ڕۆیـشتم شاردمەوە و هاتمـەوە بـۆ لای و پێی ووتم: بڕۆ خۆت بشۆرەو هیچ نەکەیت تا دێیتەوە لام، منیش چووم خۆم شت و هیچم نەکرد تا هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئنجا هەندێ دوعای بۆ کردم کە لەلام خۆشەویستر بوو لەووشترە سوور و ڕەشە قەڵەوەکان) [٢٥٣] .

لە پاداشتی ئەو هەموو چاکەیەی ئەبو طالب کە کردی سـەبارەت بـە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە بــەرگری و بەگــژدا چــوونەوەی کــافرانی قــورەیش و دوژمنکاریــەکانیان بەرامبــەر بــە پێغەمبەر (ﷺ) وە سەرەڕای شیعرە جوانەکەی کە بەناوبانگە بە (القـصيدة اللاميـة) کـە لـە مەدحی پێغەمبەر (ﷺ) دا دایناوە و لە شیعرەکاندا بەخراپە باسی هاوبـەش پەیداکارەکان دەکات وە لایەنی چاکەی موسوڵمانان باس دەکات، وە دووپاتی دەکاتەوە کە محمد ڕاسـتگۆیە و هەرگیز درۆی نەکردووە، بۆیە پێغەمبـەر (ﷺ) تکـای بـۆ دەکـات لـە ڕۆژی قیامـەت دا کـە سزاکەی لەسەر سوك بکرێت:(عەبباسی کوڕی عبدالمطلب برای ئـەبو طالـب بـە پێغەمبـەر (ﷺ) ی ووت: ئایا هیچ سودێکت بە ئەبو طالب گەیانـدووە چـونکە ئـەو یارمـەتی دەدایـت و توڕەدەبوو لە پێناوی تۆدا؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (نعـم وجدتـه فـی غمـرات مـن النـار فأخرجته الی ضحضاح من النار) واتە: بەڵێ دۆزیمەوە لە ناوەڕاستی دۆزەخ دا بوو من دەرم

---

[٢٥٣] أخرجه: النسائي (١/١١٠ ، ٤/٧٩) ، و أبو داود (٣٢١٤) ، و عبدالرزاق (٩٩٣٦)، و أحمد (١/١٣٠) (٧٥٩،٨٠٧،١٠٧٤) و قال محققه الأرناؤوط: إسـناده ضـعيف، والطيالـسي (١٢٠) ، و ابـن أبـي شـيبة (٣/٣٤٧) ، و البيهقي (١/٣٠٤-٣٠٥) و ضعفه في (الدلائل) (٤/٣٤٨)، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح النسائي) (١٨٤ ، ١٨٩٥) و في (السلـسلة الـصحيحة) (١٦١) و في (أحكـام الجنـائز) (١٦٩) مسألة الدفن و توابعه.

هێنا بۆلای تەنکاییی و قەراغی ئاگری دۆزەخ ... )[٢٥٤] .

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ([لعله تنفعه شفاعتي يوم القيامة فيجعل في ضحضاح من النار يبلغ كعبيه يغلي منه دماغه (ولولا أنا لكان في الدرك الأسفل من النار)[٢٥٥] ] [٢٥٦] واتە: بەڵكو تکاکردنی من لە ڕۆژی قیامەت دا سودی پێ بگەیەنێت وبکرێتە پارچەیەك ئاگر کەتا قولەپێ دەگرێتەوە ودەماغی دەکوڵێنێت، وەئەگەر من نەبومایە لەقوڵاییی دۆزەخدا دەبوو، لە پاداشتی ئەو هەموو چاکەیەی کە کردی بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) .سوکترین سزا دەدرێت لە ناو خەڵکانی دۆزەخدا. هەر لە ئیبن و عەبباسەوە (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (( ان اهون أهل النار عذابا ابا طالب و هو منتعل بنعلين يغلي منهما دماغه)) واتە: (سوکترین سزا دراوی ناو دۆزەخ ئەبو طلیبە کە دوو نەعلی ئاگرینی بە قاچ دا کراوە و و دەماغی دەکوڵێنێت ... ) [٢٥٧] .

# مردنی خەدیجەی کچی خوەیلد

ئیبنوئیسحاق دەفەرموێت:(خەدیجەو ئەبوطالب لەیەك ساڵدا مردن . بەمردنی خەدیجە ناخۆشیەکانی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) زیادی کرد چونکە یاریدەدەرێکی ڕاستگۆیانە بوو بۆ ئیسلام و بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ) [٢٥٨] .

ئیمامی حاکم دەفەرموێت: (مردنی خەدیجە دوای ئەبوطالب بوو بەسێ ڕۆژ ) [٢٥٩] .

بەڵام ئیبن وجەوزی دەفەرموێت: ((ئەبوطالب و خەدیجە مردن ماوەی نێوانیان تەنها مانگێك و پێنج ڕۆژبوو نارەحەتی وموسیبەت زۆر سەخت بوو لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) تا

---

[٢٥٤] أخرجه: مسلم في (الصحيح )(٥١٠).

[٢٥٥] أخرجه: البخاري (٣٨٨٥ )، و مسلم (٥١١)، و أحمد (٩/٣)، و البيهقي في (الدلائل) (٣٤٧/٢)، و ابن حبان (٦٢٧١) و قال محققه: صحيح.

[٢٥٥] أخرجه: البخاري (٣٨٨٣)، و مسلم (٥٠٩)، و الحميدي (٤٦٠)، وأحمد في (المسند)(٢٠٦/١) و في (فضائل الصحابة )(١٧٥٨)، و عبدالرزاق (٩٩٣٩)، و أبو عوانة ( ٩٦/١).

[٢٥٧] أخرجه: مسلم ( ٥١٥).

[٢٥٨] أنظر: سيرة ابن هشام (٢٦/٢)، و الطبري في (التأريخ) ( ٣٤٣/٢).

[٢٥٩] أنظر: ابن سعد في (الطبقات) (١٨/٨).

ناچار بو تەنها لەماڵەوە بێتو نەیەتە دەرێ وە قورەیش ئەوەی کەنەیان دەوێرا پێشتر بیکەن بەرامبەری لەوە بە دواوە ئەنجامیان دا)) [٢٦٠]، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((مازالت قريش كاعه حتى توفى ابو طالب)) واتە: (قورەیش هەمویان ترسنۆك بوون بەرامبەرم تاكو ئەبوطالب مرد)[٢٦١].

خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) ماوەیەکی زۆر ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ) بردۆتە سەر وهیچ ژنێکی بەسەردا نەهێناوە، وەهەموو مناڵەکانی تەنها لەوئافرەتە بەرێزەیە، بێ گومان زۆر بەچاکە باسی دەکرد، وە لە چاکێتی دا خوای گەورە پلەی تایبەتی بۆ داناوە، لەئەبوهورەیرەوە (ﷺ)دەفەرموێت: (جبريل عليه السلام ) هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وە فەرمووی ئەی موحەمەد ئەوە خەدیجەیە دێت بۆ ئێرە قاپێکی پێە خواردنی تیایە (یان ئاو) ئەگەر هات بۆ لات سەلامی پێبگەیەنە لەلایەن خواوە وەلایەن منیشەوە (واتە:خوا سەلام لەخەدیجە دەکات وەسەلامی منیشی پێ بگەیەنە) وە مژدەشی بەرێ بەکۆشکێك لەبەهەشتدا کەنارەحەتی و غەلبە غەڵبی تیانی یە) [٢٦٢]، خەدیجەش لەوەڵامدا فەرمووی : (خوای گەورە سەلامەو سەلامیش لەجبریل بێت وەسەلام ورحمەت وبەرەکەت لەتۆش بێت ئەی پێغەمبەری خوا) [٢٦٣]، هەروەها خەدیجە (رضي الله عنها) یەکێکە لەهەرە ئافرەتە بەرێزەکانی ئەهلی بەهەشت لەدونیادا.

لە ئیبن عەباسەوە (ﷺ) دەفەرموێت: (پێغەمبەر (ﷺ)چوار هێڵی کێشا لەزەویداو ئنجا فەرموی ئەزانن ئەم چوار هێڵە چین؟ ووتمان : خواو و پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن . فەرمووی: ((افضل نساء اهل الجنة خديجة بنت خويلد، و فاطمة بنت محمد، و مريم بنت عمران،

---

[٢٦٠] أنظر: المنتظم لابن الجوزي (٣/١١).

[٢٦١] أخرجه: الحاكم (٢/٦٢٢) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي ، و قال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة ) ( ٣١): إسناده جيد.

[٢٦٢] أخرجه: البخاري (٣٨٢٠)، و مسلم (٦٢٢٣)، و أحمد في (المسند) ( ٢/ ٢٣١) و في (الفضائل )(١٥٨٨) و قال محققه: إسناده صحيح، و ابن أبي شيبة( ١٢/١٣٣)، و الحاكم (٣/١٨٥) و صححه و وافقه الذهبي، و الطبراني في (الكبير)( ٢٣/١٠)، و ابن حبان (٧٠٠٩) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[٢٦٣] أخرجه: النسائي في (الكبرى) ( ٨٣٥٩)، و قال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين ) ( ١١٦): حديث حسن.

و اسية بنت مزاحم امراءة فرعون)) واتە: (چاکترین ئافرەتانی ئەهلی بەهەشت خەدیجەی کچی خوەیلد و فاتیمەی کچی محمد ومەریەمی کچی عمران و ئاسیای کچی مزاحمی ژنی فرعەونە)[٢٦٤] .

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز باسی خەدیجەی فەرامۆش نەکردووە و لەیادی نەچووە و زۆر جاریش لای عائیشە گێڕاویەتی یەوە، عائیشە (رضى الله عنها ) دەفەرموێت: ((کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) باسی خەدیجەی بکردایە زۆر بەچاکی باسی دەکرد ، منیش ڕۆژێك تورە بووم لەو قسەیە ووتم : ئەوە ئەوەندە بۆ باسی دەکەیت ئافرەتێکی لێو سوری پیر بوو خوای گەورە لەوە چاکتری پێ بەخشیویت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ((أبدلني الله خيراً منها؟ قد آمن بي إذ كفر بي الناس، وصدقني إذ كذبني الناس، و واستني بمالها إذ حرمني الناس، و رزقني الله أولادها و حرمني أولاد الناس)) واتە: خوای گەورە لەوە چاکتری پێ بەخشیوم؟ باوەڕی پێ هێنام کاتێ هەموو خەڵکان باوەڕیان پێ نەهێنام و بەڕاستی خستمەوە کاتێ هەموو خەڵکان بەدرۆیان خستمەوە، بەماڵ و بەنەفسی خۆی پشگیری کردم کاتێ خەڵکان دژم وەستان وە خوای گەورە لەو منالی پێ بەخشیم وە لە هیچ ژنێکی تر منالی پێ نە بەخشیم)[٢٦٥]، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) وەك ڕێزگرتنێك لە خەدیجە ڕێزی لەخزم و دۆستەکانیشی دەگرت لەدوای مردنی ..

عائیشە (رضى الله عنها) دەفەرمووێت :(دڵپیس نەبووم بەرامبەر بە یەکێ لەخێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندەی کە دڵپیس بووم بەرامبەر بە خەدیجە هەرچەندە نەشم دی بوو لەژیانمدا، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر جار باسی دەکرد وە هەندێ جار ئەگەر مەڕی سەر بڕیایە پارچە پارچەی دەکرد و دەینارد بۆ هاوڕێکانی خەدیجە وەهەندێ جاریش پێم دەووت: دەڵێ ی ئافرەت نی یە لەسەر دنیادا تەنها خەدیجە نەبێت؟،

---

[٢٦٤] أخرجه: أحمد في (المسند) ( ٢٩٣/١) (٢٦٦٨) وقال محققه : اسناده صحيح ، و في (الفضائل ) (٢٥٠)، و النسائي في (الكبرى ) (٨٣٦٤)، و الطحاوي في (مشكل الآثار) (١٤٨)، و أبو يعلى (٢٧٢٢ )، و الطبراني في (الكبير ) ( ١١٩٢٨)، و ابن حبان (٧٠١٠) و قال محققه: إسناده صحيح ، و قال الحافظ في (الفتح) ( ٥٨٣/٦): إسناده صحيح .

[٢٦٥] أخرجه: احمد ٦(/١١٧) (٢٤٨٦٤) وقال محققه : اسناده صحيح، والطبراني في (الكبير)(٢٢/٢٣)، و قال ابن كثير في (البداية) ( ١٢٩/٣): إسناده لابأس به ، و قال الهيثمي في (المجمع) ( ٢٢٤/٩): إسناده حسن .

پێغەمبــەریش (ﷺ) دەیفــەرموو ((خەدیجــە ئاوهــابوو ئاوهــابوو وە هــەتا منالّیــشم لێ ی هەبوو)) [٢٦٦] .

دوای مردنــی خەدیجــە، پێغەمبــەر (ﷺ) عائیــشەی کــچی ئەبوبــەکری مــارە کــرد وە نەیگوێزایەوە، بەلاّم سەودەی کچی زەمعەی مارە کردو لەوێ گوێزایەوە پێش ئەوەی عائیشە بهێنێت، وە خوای گەورە سێ جار عائیشەی نیشانی پێغەمبەر (ﷺ) دا وە لەخەودا لــە پــێش مارە کردنی یەوە فریشتەیەك لەپارچەیەك ئاوریشمدا هێناویەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ).

خاتوو عائشە دەفەرموێت: (پێغەمبــەر (ﷺ) پــێ ی ووتم: ((اريتـك في المنـام ثـلاث ليـال، جاءني بك الملك في سرقة من حرير، فيقول : هذه امراتك فاكشف عـن وجهـك (الثـوب)) فـاذا انت هي، فاقول : ان يك هـذا مـن عنـدالله يمـضه)) واتــە: تــۆم بینــی لــە خــەو دا ســێ شــەو و فریــشتەیەك تــۆی دەهێنــا بــۆ لام لــە نــاو پارچــە ئاورێــشمێکدا و دەیــووت: ئــا ئەمــە خێزانەکەتە، منیش ئاوریشمەکەم بە سەر دەم و چاوتەوە لا دەبــرد و تەماشــام دەکــرد تــۆ بویت، منیش دەمووت: ئەگەر ئا ئەمە لای خواوە بێت دەی هێنێتەدی) [٢٦٧] .

## بە سەر هاتی خوازبێنی کردنی خاتوو عائیشەو سەودە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

عائیشە (رضی الله عنها) دەفەرموێت: ( کاتێ خەدیجە وەفاتی کرد، خەولەی کــچی حــەکمی کــوڕی ئەوقــەس خێزانــی عثمــانــی کــوڕی مــضعون هــاوەڵی پێغەمبــەر(ﷺ): لــە مەککــە بــە پێغەمبــەری (ﷺ) ووت: ئــەی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) بــۆ ژن ناهێنیــت ؟ پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموی : کێ ؟ ئەویش ووتی: ئەگــەر ویــستت لێ یــە کــچ هەیــە وە ئەگــەر ویــستت لێ هــەبێ ژنیش هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) فــەرمووی: کچەکەیان کــێ یــە؟ ووتــی: کچی خۆشەویــسترین دروست کراوە لای تۆ، عائشەی کچی ئەبو بەکرە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی ژنەکە

---

[٢٦٦] أخرجه: البخاري (٣٨١٨)، و مسلم (٦٢٢٩)، وأحمد في (المسند)(٥٨/٦) و في (الفـضائل)( ١٥٨٩) و قال محققه: إسـناده صـحيح ، و الترمـذي (٢٠١٧)، و الحـاكم( ٥٨٩/١)، و صـححه الـشيخ الألبـاني في (صحيح الترمذي )( ١٦٤١).

[٢٦٧] أخرجه: البخاري (٥١٢٥)، ومسلم ( ٦٢٣٣)، و اللفظ له وأحمد ( ١٢٨/٦)، وابن حبان( ٧٠٩٤).

كێ یە؟ ووتی: سەودەیە كە باوەڕی پێت هێناوە و شوێنت كەوتووە لەسەر ئەو باوەڕەی كە تۆ لەسەریت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو : بڕۆ خوازبێنی هەردووكیانم بۆ بكە . ئەفەرموێت: چووم بۆ ماڵی ئەبوبەكر، ئوم ڕومانی دایكی عائشە لە ماڵ بوو پێم ووت: ئەی ئوم ڕومان ئای لەو دەرگا خێرو بەرەكەتەی كە بە رووی ئێوەدا كراوەتەوە ئەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) منی ناردووە بۆلاتان تا خوازبێنی عائشە بكەم ، ئوم ڕومانیش ووتی: خۆزگە دەخوازم بەڵام چاوەڕێكە تا ئەبوبەكر دەگەڕێتەوە، ئەوە بوو ئەبوبەكر گەڕایەوە و (خەولە) پێ ی ووت: ئەی ئەبوبەكر خوای گەورە چ دەرگایەكی خێرو بەرەكەتی بەڕوودا كردویتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ناردوومی تا خوازبێنی عائشە بكەم، ئەبوبەكر ووتی: ئایا بۆی دەشێت چونكە عائشە كچی براكەیەتی؟ ئەفەرموێت: ئەویش گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وە قسەكەی ئەبوبەكری بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (بڕۆرەوە بۆلای و پێی بڵێ تۆ برامی لە ئیسلام دا ئەویش دەشێ بۆ من) ئەفەرموێت:

چووە وە بۆلای ئەبوبەكر و پێی ڕاگەیاند، وە ئەبوبەكریش ووتی: با پێغەمبەر (ﷺ) تەشریف بهێنێت )[٢٦٨].

(لەڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت: كە پێغەمبەر (ﷺ) هات ئەبوبەكر پێی فەرموو: من برای تۆم ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((انت اخي في دين الله و كتابه، و هي لي حلال)) واتە: تۆ برای منی لە ئاینەكەی خواو كتێبەكەی خوادا و ئەویش حەڵاڵە بۆمن، وە پێغەمبەر (ﷺ) مارەی كرد ...)[٢٦٩] . لە ڕیوایەتێكی تردا : ( دوای ئەوە خەولە خێزانی عثمانی كوڕی مضعون ڕۆی بۆلای سەودەو پێی ووت: ئای سەودە خوای گەورە چ خێرو بەرەكەتێكی بەڕوودا كردونەتەوە؟ ووتی: چی بووە؟ ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردوومی بۆلای تۆ خوازبێنیت بكەم ؟ ئەویش ووتی: خۆزگە دەخوازم بەڵام بچۆ بۆلای باوكم و ئەوەی بۆی هاتووی پێی ڕابگەیەنە ؟ دەفەرموێت : باوكی پیاوێكی بە ساڵاچووی پیربوو نەیدەتوانی

---

[٢٦٨] أخرجه: أحمد ( ٦/٢١٠-٢١١)(٢٥٧٦٩) وقال محققه: اسناده حسن، و الطبراني في (الكبير) ( ٢٣/٢٣)، و قال الحافظ في (الفتح) ( ٧/٢٢٥): إسناده حسن ،و البيهقي (الدلائل ) (٢/٤١١)، و قال الهيثمي في (المجمع) (٩/٢٢٥): رواه الطبراني و رجاله رجال الصحيح غير محمد بن عمرو بن علقمة و هو حسن الحديث.

[٢٦٩] أخرجه: البخاري (٥٠٨١).

هەتا بچێت بۆ حەج (خەولە دەفەرموێت) : چوومە ژوورەوە بۆ لای و سڵاوم لێ کرد بە سڵاوی جاهیلانەی خۆی وە ئەویش ووتی: ئەوە کێیە ؟ ووتم: خەولەی کچی حەکیمە ووتی: ها چیت دەوێت؟ ووتم:

محمدی کوڕی عەبدوڵا ناردوومی بۆلای تۆ تا سەودەی بۆ خواز بێنی بکەم، ئەویش ووتی : هاوشانێکی بەڕێزە هاوڕێکەت دەڵێ چی؟ خەولەش ووتی: پێ ی خۆشە، باوکی سەودەش ووتی: دەبچۆ بۆم بانگ بکە، منیش چووم بۆم بانگ کرد و پێ ی ووت: کچەکەم محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب دەیەوێ خوازبێنیت بکات محمدیش پیاوێکی هاوشانی بەڕێزە پێت خۆشە مارەت بکەم بۆ محمد؟ ئەویش ووتی: بەڵێ، باوکی سەودەش ووتی: دەبچۆ محمدم بۆ بانگ بکە، پێغەمبەر (ﷺ) هات و باوکی ڕازی بوو، پێغەمبەر (ﷺ) سەودەی مارەکرد و گوێزایەوە) [٢٧٠] .

## چوونی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ شاری طائیف

ئیبن و ئیسحاق دەفەرموێت: ( کاتێ ئەبو طالب لەناو چوو قوڕەیش دەستی کرد بە ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەیەك کە هەرگیز نەیان دەتوانی لە ژیانیانی ئەبوطالبدا ئەنجامی بدەن بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) ) [٢٧١] . پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێکەوت بەرەو شاری طائف بۆ ئەوەی خەڵکانی سەقیف پشتگیری لە خۆیی و لە ئاینەکەی بکەن وە بۆ ئەوەی پەیامی خوای گەورەیان پێ بگەیەنێت ، دەرچوونی پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو طائف لە هەموو سەرچاوەکانی سیرەدا تەنها ڕیوایەتەکەی محمدی کوڕی کەعبە کە دەفەرموێت: (کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە طائف چووە لای هەندێ کەسایەتی سەقیف کە لەو ڕۆژەدا کەسانێکی ناودارو سەرکردەی سەرجەم طائف بوون کە سێ برا بوون (عەبدیالیل کوڕی عمرو کوڕی عومەیر)، (مەسعودی کوڕی عەمری کوڕی عومەیر)، (حەبیبی کوڕی عمرو کوڕی عومەیر) یەك لەوانە ئافرەتێکی قوڕەیش ی لابوو کە مارەی کرد بوو، پێغەمبەر

---

[٢٧٠] أخرجه: أحمد (٢٥٧٦٩) وقال محققه : إسناده حسن، و قال الذهبي في (سير إعلام النبلاء) ( ١/١٩١): إسناده حسن ، و قال الحافظ في (الفتح) ( ٧/١٧٦): إسناده حسن .

[٢٦٥] أنظر: سيرة ابن هشام ( ٢/٢٩).

(ﷺ) دانیشت لە گەڵیاندا و بانگەوازی کردن بۆلای خواو پێی ڕاگەیاندن کە بۆچی ڕووی کردۆتە ئەو شارە، یەك لەوانە لە وەڵامدا ووتی: من بەرگەکەی کەعبە پارچە پارچە دەکەم ئەگەر خوا تۆی ناردبێت بە پێغەمبەر، ئەوی تریشیان ووتی: ئایا خوا کەسی تری نەدۆزیوەتەوە تەنها تۆ نەبێت، سێ یەمیشیان ووتی: بڕۆ بە هیچ جۆرێك قسەت لەگەڵدا ناکەم ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوا بیت وەکو خۆت دەڵێیت ئەوە زۆر سامناکە بۆ من کەوەڵامت بدەمەوە وە ئەگەر تۆ درۆ بکەیت بەناوی خواوە بە هیچ جۆرێك شیاو نی یە کەمن قسەت لە گەڵدا بکەم ، ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) بێ هیوا بوو لە سەقیف کە ڕێنمونی بکرێن و پشتگیری لە ئیسلام بکەن...) [٢٧٢] .

محمدی کوڕی کەعبی قورضی دەفەرموێت: (پێغەمبەر (ﷺ)پێی ناخۆش بوو کە ئەم هەواڵە بگاتەوە بە خزم و کەسانی قەومی خۆی بەڵام خەڵکی ئەو شارە وازیان نەهێنا نەفام و کۆیلەکانیان خستە دوای پێغەمبەر (ﷺ) و جوێنیان پێ دەدا و هاواریان لێ دەکرد هەتا خەڵکانێکی زۆریان لێ خڕکردەوە و بە دوای دا کەوتن، تا پێغەمبەر (ﷺ) بەناچارانە ڕووی کردە باخەکەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕبیعە(واتە:دوو دوژمنی سەر سەختی پێغەمبەر (ﷺ) لە شاری مەککە) کە پێغەمبەر (ﷺ)چووە ناو ترێکەیانەوە ئەنجا نەفامەکانی سەقیف کە دوای کەوتبوون گەڕانەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) چووە ژێر سێبەری مێوێکیانەوە وە هەردوو کوڕەکەی ڕەبیعە تەماشای پێغەمبەریان (ﷺ) دەکرد کە کۆیلەکانی سەقیف چی دەکەن بەرامبەری کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە ژێر سێبەری مێوەکەدا ئارام بوو کەمێك حەوایەوە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:

ئەم دوعایەی کردو فەرمووی : (ئەی پەروەردگار شکاتی لاوازی و بێ دەسەڵاتی و فێڵ نەزانی و سوکیم لەلای خەڵکان تەنها لای تۆ دەکەم کە بە بەزە یترین خاوەن بە بەزەییەکانی، تۆ خاوەنی چەوساوەکانی و خاوەنی منی بۆلای کێم دەنێریت بۆلای دوژمنێك کە ڕووم لێ گرژ دەکات یان دوژمنێك کە کاری منت کردووەتە ژێر فەرمانی ئەو،

---

[٢٧٢] أنظر: سيرة ابن هشام رقم (٢٩٩) و قال محققاه: إسناده صحيح و لكنه مرسل، والطبري في (التأريخ) ( ٣٤٤/٢) ،و البيهقي في (الدلائل) ( ٤١٥/٢)، و قال الشيخ الألباني في (فقه السيرة )( ١٣٢): إسناده صحيح لكنه مرسل. (تەنها بۆ زانیاریت هێناومە بەڵام ئەم فەرموودەیەش ضعیف و لاوازە ئاگاداربە)

ئەگەر تۆ هیچ تورە نەبێت لەمن ئەوا من هیچ باکم نی یە، بەڵام سەلامەتی تۆ فراوانترە بۆ من .پەنا دەگرم بەو نوری ڕوەت: کە هەموو تاریکایەکی لە ڕوودا ڕووناك کردۆتەوە، و دونیاو کۆتایی لەسەر چاکراوەکە لەوەی تورەبوونی خۆتم پێ بگەیەنیت یان ڕقی خۆتم پێ بگەیەنیت جێ ی خۆیەتی گلەیت هەبێت تا ڕازی دەبیت وە هیچ توانا و دەسەلاتم نی یە تەنها بەپشتیوانی تۆ نەبێت ...)[٢٧٣]. ، دوای ئەوەی دوو کوڕەکەی ڕەبیعە واتە: عوتبە و شەیبە بینیان پێغەمبەر (ﷺ) چی بەسەر هاتووە بەزەییان بۆی بزوا ئەنجا خزمەتکارێکی گاوری خۆیان بانگ کرد کە ناوی عداس بوو پێیان ووت: ئەو هێشووە ترێ یە بکەرە سەر ئەو دوو گەڵایە و بیبە بۆ ئەو پیاوە کە لە وێدا دانیشتووە با بیخوات، عەداس چوو لە بەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دا دایناو پی ی ووت: بیخۆ ؟ پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بۆ بردوو فەرمووی: (بسم الله) ئنجا، خواردی، عەداس تەماشای پێغەمبەر (ﷺ) ی کردو پی ی ووت: وەڵاهی ئەم ووشەیە هیچ کەسێك لە خەڵکەکانی ئەم وولاتانە نایڵێن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ خەڵکی کام وولاتی؟ ئەی عەداس و ئاینت چی یە؟ووتی: من گاورم و خەڵکی نەینەوام، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دێیەکەی پیاو چاکەکە (یونسی کوڕی مەتا)؟ عەداس ووتی: تۆ چۆن دەزانی یونس کێ یە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

ئەوە برامە پێغەمبەر بووە منیش پێغەمبەرم، عەداس کەوتە ماچ کردنی دەم و چاوی پێغەمبەر (ﷺ)و هەردوو دەستی و هەردوو قاچی ماچ کرد، وە دوو کوڕەکەی ڕەبیعە لە دوورەوە چاویان لێ بوو کە عەداس چی دەکات یەکێکیان بەوی تریانی ووت: ئەوە خزمەتکارەکەمانی تێك دا، کاتێ عەداس گەڕایەوە بۆ لایان پێیان ووت: ماڵت وێران بێت عەداس ئەوە چی بوو تا دەستی ئەو پیاوەت ماچ کرد؟ ووتی:گەورەم لەسەر زەویدا پیاوی واچاکتر نی یە شتێکی بۆ گێڕامەوە کە تەنها پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت نایزانێت؟ ووتیان: عەداس ماڵت وێران بێت دوورت نەخاتەوە لە ئاینی خۆت چونکە ئاینی تۆ لە دینی ئەو

---

[٢٧٣] أخرجه: أحمد: (٣٣٥/٤)، و الطبراني في (الكبير) (٤٣٥/٢)، و الطبري في (التأريخ) (٨٠/١)، و أبو نعيم في (الدلائل) (٢٢١)، و قال الحافظ العراقي: في (الأحياء) (١٣١/٤) مرسل، و قال الهيثمي في (المجمع) (٣٥/٦): رجاله ثقات إلاّ أن فيه تدليس ابن إسحاق، و قال الشيخ الألباني في (السلسلة الضعيفة) (٢٩٣٣) و في (ضعيف الجامع) (١١٨٢) و في (فقه السيرة) (١٣٢): حديث ضعيف. (خوێنەری بەڕێز ئاگاداربە ئەم فەرموودەیە لاوازە (ضعيف) ە).

چاکترە )[٢٧٤]. ئەمە سەرجەم بەسەرهاتی طائفە کە ئەویش حەدیسێکی (مرسل)ە کە بەشێکە لە بەشەکانی (ضعیف) ەو ناشێت بکرێت بە بەڵگە، بەڵام وەك زانیاری پێویستە لێ ی ئاگاداربین . بەڵام بە دوو بەڵگەوە دەسەلمێنرێت کە چوونی پێغەمبەر (ﷺ) بۆطائف ڕاستە:

یەکەم : لە خالیدی عدوانی یەوە دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: (بینیم پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دا بوو بەسەر گۆچانێکدا یان کەوانێکدا لە ڕۆژهەلاتی سەقیف کاتێ کە هاتبوو بۆ لایان بۆ ئەوەی پشتگیری لێ بکەن، وە گوێم لێ بوو لەوکاتەدا سورەتی:﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١ ﴾ (الطارق: ١) ی دەخوێند وە تەوای کرد، ئەنجا خالد دەفەرموێت: من لە زەمانی نەفامیمدا ئەم سورەتەم لەبەر کرد کە مشرك بووم وە لە ئیسلامیش دا خوێندم دوای ئەوەی کە ئەمەم گوێ لێ بوو کەسانی سەقیفی خۆم هاتن بۆلام ووتیان: چیت گوێ لێ بووە لەو پیاوە منیش ووتم: گوێم لێ بوو کە ئەوەی خوێندی و منیش هەموویم بەسەر ئەواندا خوێندەوە و یەکێك لەوێدا کە خەڵکی مەککە بوو ووتی: ئێمە چاکتر دەزانین کە ئەم هاوەڵەمان چی یەو چی نی یە ئەگەر بمانزانیایە ئەو کارە ڕاستە شوێنی دەکەوتین )[٢٧٥]. ئەم ڕیوایەتە لاوازە (ضەعیە تەنها بۆ زانیاری هێناومە).

دووەم: لە عائیشە وە دەفەرموێت: (بە پێغەمبەرم (ﷺ) ووت: ئایا هیچ ڕۆژێك هاتووە بە سەردا سەخت تربوو بێت لە ڕۆژی ئوحود؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :((لقد لقيت من قومك ما لقيت وكان اشد ما لقيت منهم يوم العقبة، إذ عرضت نفسي على ابن عبد ياليل بن عبد كلال فلم يجبنى الى ما اردت، فانطلقت و انا مهموم على وجهي، فلم استفق الا و انا بقرن الثعالب، فرفعتُ رأسي، فإذا انا بسحابة قد اظلني، فنظرت فإذا فيها جبريل، فناداني فقال: ان

---

[٢٧٤] أخرجه: ابن هشام في (السيرة ) (رقم/٢٩٩) و قال محققاه: إسناده صحيح لكنه مرسل ، و الطبري في (التاريخ) (٢/٣٣٤)، و البيهقي في (الدلائل) ( ٢/٤١٥)، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة ) (ص:١٣٢): إسناده صحيح مرسل.

[٢٧٥] أخرجه: أحمد: ٤(/٣٣٥ )(١٨٩٥٨) وقال محققه : اسناده ضعيف، و الطبراني في (الكبير)( ٤/١٧٩) (٤١٢٦) ،و ابن أبي عصم (١٢٧٤) ، وابن خزيمة (١٧٧٨)، و قال الهيثمي في (المجمع)( ٧/١٣٦): رواه أحمد و الطبراني و عبدالرحمن ذكره ابن أبي حاتم و لم يجرحه أحد و بقية رجاله ثقات.

الله قد سمع قول قومك لك و ما ردووا عليك، وقد بعث الله اليك ملك الجبال لتأمرهُ بما شئت فيهم، فناداني ملك الجبال فسلم علي ثم قال : (يا محمد) فقال : ذلك فيما شئت ان شئت ان اطبق عليهم الأخشبين)) فقال النبي (ﷺ) (بل أرجو ان يخرج الله من اصلابهم من يعبد الله وحدهُ لايشرك به شيئاً)) .

واتە: ئەوەی تووشم بوو لە خزمانی خۆت ئەوە بوو کە توشم بوو، بەڵام سەخترینیان لای من ڕۆژی عەقەبە بوو کاتێ چووم بۆلای کوڕەکەی (عەبدیالیل) بۆ ئەوەی خۆمی پێ بناسێنم بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە و منیش بە خەفەت باریەوە گەڕامەوە و ئاگام لە خۆم نەبوو تاکو گەیشتمە لوتکەی (ڕێوی) یەکان کە سەرم بەرز کردەوە پەڵە هەورێکم بینی بە سەرمەوە بوو سێبەرەکەی بەسەرمدا هات، تەماشام کرد جبریلی تیایە، بانگی لێ کردم و ووتی: خوای گەورە قسەی خزمەکانتی بیست وە کە چیان ووت بەرانبەر بە تۆ، وە خوای گەورە فریشتەی شاخەکانی بۆ لای تۆ ناردووە بۆ ئەوەی کە بەویستی خۆت چی فەرمانێکی پێ دەکەیت بەرانبەر خزمانی خۆت تا بۆت جێ بەجێ بکات ئەنجا فریشتەی شاخەکان بانگی لێکردم و سەلامی لێکردم و ووتی: ئەی محمد ئەمە لە ویستی خۆتایە ئەگەر ویستت وایە با هەردوو شاخەکە بێنمەوە یەك و لەناویان بەرم ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:نەخێر هیوام وایە کە خوای گەورە کەسانێك دروست بکات لە نەوەی ئەوان کە خوا بپەرستن و بە هیچ جۆرێك شەریکی بۆ بڕیارنەدەن ) [٢٧٦] .

کەواتە: لێرەدا بە ڕاشکاوانە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر (ﷺ) چووە بۆ طائف وە سەخترین ڕۆژی سەرجەم ژیانی ئەو ڕۆژە بوو لە طائف دەرچووە کە ئەوان بەرپەرچیان داوەتەوە، ئیبن و سەعد دەفەرموێت: (سەفەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ طائف مانگی (شەوالی ساڵی ١٠) واتە: دەی پێغەمبەرایەتی بوو وە دەرۆژ لەناو طائف دا مایەوە و کەس باوەڕی پێ نەهێنا) کەواتە: سەلمێنرا پێغەمبەر (ﷺ)چووە بۆ طائف وەك لە ڕیوایەتەکەی: محمدی کوڕی کەعبی قرضی پێشوودا هاتووە.

---

[٢٧٦] أخرجه: البخاري (٣٢٣١) ، و مسلم (١٧٩٥) ، و أبو نعيم في (الدلائل ) ( ٢١٣)، وابن حبان (٦٥٦١)، و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم .

# گوێ گرتنی كۆمەڵێك جنۆكە بۆ قورئان

ئیبن و ئیسحاق دەفەرموێت: (پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوەی طائیفی بەجێ هێشت گەڕایەوە بەرەو شاری مەككە و بێ هیوا بوو كە خەڵكانی سەقیف پشتگیری لێ بكەن كاتێ لە ڕێگە لای دایە دۆڵی نەخلە لە نیوە شەودا كە نوێژی دەكرد تاقمێك لە جنۆكەكان بەلایدا تێپەڕین، ئەو جنۆكانە بوون كە خوای گەورە باسی كردوون لەسورەتی (الأحقاف)دا [٢٧٧] ئەوە بوو هەتا زەمانی پێغەمبەر(ﷺ) جنۆكەكان دەیانتوانی بچنە ئاسمانەكان و بە تایبەت ئاسمانی یەكەم و لەوێ گوێ بگرن لە گفتو گۆی فریشتەكان ، تا بزانن خوای گەورە بڕیاری چی ی داوە بۆ سەر زەوی ، وە تا كێ دزی كردوەو كێ چی كردووە وە چی بووە و چی نەبووە بۆ ئەوەی ئەو قسانە بدزن و تا بیچرپێنن بە گوێی فاڵچی یەكاندا، بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕێگەیەیان لێ گیرا شاڵاوی ئاگریان كرایە سەر و بە هیچ جۆرێك لەوێوە نەیان دەتوانی بەرز ببنەوە .

ئیبن و عەباس (ﷺ) دەفەرموێت: (جنۆكەكان بەرز دەبونەوە بۆ ئاسمان و گوێیان لە وەحی دەگرت گەر ووشەیەكیان بەر گوێ بكەوتایە نۆ قسەیان پێوە دەنا و درۆیان تێكەڵاو دەكرد، ئەوە بوو قسە ڕاستەكە ڕاست دەردەچوو بەڵام ئەوانەی تر كە بۆیان زیاد كردبوو درۆ دەردەچوو، كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نێررا جنۆكەكان شوێن دانیشتنەكانیان لێ قەدەغە كرا ئەوەیان گێڕایەوە بۆ ئیبلیس و چونكە لە پێشتر شاڵاوی ئەستێرە و شاڵاوە ئاگرییەكان نەدەگیرایە هیچ كەس، ئیبلیس پێی ووتن: ئەمەی كە بووە تەنها لەبەر شتێكە كە لە زەویدا ڕووی داوە ئەنجا سەربازەكانی بڵاوە پێ كرد تا جنۆكەكان بینیان پێغەمبەر(ﷺ) نوێژ دەكات لە نێوان دوو شاخدا و گەڕانەوە بۆلای ئیبلیس و هەواڵەكەیان پێ ڕاگەیاند، ئینجا ئیبلیس ووتی: ئەمە ئەو ڕووداوەیە كە ڕووی داوە [٢٧٨] ) .

---

[٢٧٧] انظر:سيرة ابن هشام (٣٢/٢) (٢٩٩)، و ابونعيم في (الدلائل) (٢٥٩) بدون اسناد، ،و اسنده ابن مرؤية عن ابن عباس ،انظر: (الفتح)(٣٠٠/١٠).

[٢٧٨] اخرجه: احمد (١٧٤/١) (٢٩٧٧) ، و قال محققه: اسناده حسن، والنسائي في (التفسير) (٦٤٦)، و قال محققه: صحيح،و الترمذي (٣٣٢٤)، و قال حديث صحيح ،و الطبراني في (الكبير) (١٢٤٣١)،و البيهقي في (الدلائل)(٢٢/٢)،و صححه الشيخ الألباني فى (صحيح الترمذي )( ٢٦٤٨) .

وە هەروەها لە ئیبن و عەباسەوە دەفەرموێت : (پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ چەندین کەس لە هاوەڵانی هاتن بەرەو بازاڕی (عکاظ) واتە : (بازاڕەکەی دۆڵی ی نەخلە) لەو کاتەدا شەیتانەکان ڕێگەی ئاسمانەکانیان لێ گیرا بوو وە پریسکە و شاڵاوی ئاگریان تێدەگرا، ئەوان گەڕانەوە بۆ لای کەسانی خۆیان و ووتیان: وامان لێکراوە کە نەتوانین بەرز ببینەوە و هەواڵی ئاسمانەکانمان پێ نەگات و شاڵاوی ئاگرمان تێ دەگیرێت ، ئەوانیش ووتیان: ئەمەی وای لە ئێوە کردووە کە نەتوانن بچن بۆ ئاسمان و گوێ بگرن، دیارە شتێك ڕووی داوە بڕۆن بگەڕێن بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا بڕوانن و بزانن ئەم شتە چی یە وای لێکردوون هەواڵی ئاسمانتان لێ قەدەغە بکرێت؟ ئەوانیش ڕۆیشتن بە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی زەویدا تا بزانن ئەوەی کە ڕێگرە بۆیان لە زانینی هەواڵی ئاسمان چی یە؟ ئەو تاقمە بەرێکەوتن بەرەو دۆڵی توهامە و بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) وەلای دۆڵی (نەخلە) پێی گەیشتن کاتێك بەرەو بازاڕی (عکاظ) دەڕۆیشت، پێغەمبەر(ﷺ) لەوێ نوێژی بەیانی بە هاوەڵانی دەکرد، جنۆکەکان کە قورئانەکەیان بەر گوێ کەوت وەستان و گوێیان بۆ گرت و ووتیان:

وەڵاهی ئا ئەمەیە کەوای لێی کردووین نەتوانین گوێ بگرین لە هەواڵی ئاسمان، ئالەو کاتەدا گەڕانەوە بۆلای خزمانیان و هەواڵی ئەوەیان پێ گەیاندن ووتیان: ئەی خزمان ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسوڕهێنەر بوو کە خەڵکان ڕێنمویی دەکات بۆ ڕاستی و ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە و بەهیچ جۆرێ هاوتا بۆ خوای خۆمان بڕیار نادەین ((ئەفەرموێت)) ئینجا خوای گەورە سورەتی (جن)ی هێنایە خوارەوە:

﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ① ﴾ (الجن: ١ )[٢٧٩] ئەوانەی کە هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) وەکو تاقمی جنۆکە حەوت کەس یان نۆ کەس بوون لەهەرە پاڵەوان و بەتوانا و زیرەکانی(جن) .

(٢٧٩) اخرجه: البخاري (٧٧٣ ، ٤٩٢١)، ومسلم (١٠٠٥)،و النسائي في ( التفسير) (٦٤٥) ،و الترمذي (٣٣٢٣)، و احمد (١/٢٧٤) ، و الطبراني في (الكبير )(١٢٤/٤٩)، و ابن حبان (٦٥٢٦)، و قال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم ، و البيهقي في (الدلائل) (٢/٢٢٧)، و الحاكم (٢/٥٠٣) و صححه و وافقه الذهبى ، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي ) (٢٦٤٦) .

ئیبن و مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ( جنۆکەکان دابازینە سەر پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە قورئانی دەخوێند ) [٢٨٠] . لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ( کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی عیشای دەکرد لە دۆڵی نەخلە) جنۆکەکان کە قورئانیان بەر گوێ کەوت ووتیان: بێدەنگ بن وە هەموویان نۆ کەس بوون یەکێکیان ناوی (زوبەع)بوو، ئنجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە (ئەفەرموێت):

﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الأحقاف: ٢٩) [٢٨١] .لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبن و عەباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ( ئەوانە حەوت کەس بوون لە جنۆکەکانی (نصیبین)(کە شارێکە لە سوریا) پێغەمبەر(ﷺ) ئەو حەوت کەسەی کرد بە نێراوی خۆی بۆ گەیاندنی ئیسلام بە جنۆکەکانی خزمانی خۆیان) [٢٨٢]، وەهەر لەو شەوەوە بەشدار بوون، دیارە ئەو کۆمەڵە جنۆکەیە کە هاتونەتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و گوێیان لێ گرتووە یەکەم جار نەیبینیون وە هەستیشی پێ نەکردوە کە ئەوان هاتوون و لە نزیکی یەوە وەستاون و گوێیان لە قورئانەکەی گرتووە، بۆیە مەسروق قوتابی ئیبن مەسعود دەفەرموێت:

( پرسیارم کرد لە ئیبن مەسعود ووتم : کێ پێغەمبەری(ﷺ) ئاگادار کردەوە لە جنۆکەکان لەو شەوەدا کە ئەوان هاتن و گوێیان لە قورئان خوێندنەکەی گرت ؟ ئیبن و مەسعود فەرمووی: دارێکی (السمر) پێغەمبەری ((ﷺ) ی لێ ئاگادارکردنەوە) [٢٨٣] و هاتنی نوێنەرانی جنۆکە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) هەر ئەم جارە نەبووە بەڵکو چەندین جار بووە و ژمارەیان

---

[٢٨٠] اخرجه: الطبراني في ( الكبير) (١٢٤٣١)، والحاكم (٤٥٦/٢)و صححه و وافقه الذهبي ،و ابو نعيم في (الدلائل ) ( ٣٠٤) ، والبيهقي في (الدلائل ) (٢٥/٢) .

[٢٨١] اخرجه: احمد (١٦٧/١)(١٤٣٥) وقال محققه : حسن لغيره ، و ابن جرير(٢٤٢٢٥١)، و البزار (٥٥٢٢) و قال الحافظ في (الأصابة) (٨٤٧): سنده جيد، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٣٢/٧): رواه احمد و رجاله رجال الصحيح .

[٢٨٢] اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٦٦٠)و ابن جرير (٤٢٢٦ ) الأرناؤوط في (زاد المعاد) (٩٦/١): اسناده حسن.

[٢٨٣] اخرجه: الحميدى (٢٣) ، البخاري (٨٥٩)، و مسلم (١٠٠١)، و ابو نعيم في (الدلائل) (٢٥٤) .

جیا جیا بووە کە هاتونەتە خزمەت سەروەری پێغەمبەران(علیهم الصلاه والسلام) بۆ ئەوەی پەیامی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت تا ئەوانیش بیگەیەنە جنۆکە و کەسانی خۆیان .

(عەلقەمە)(رحمه الله) (ئەفەرموێت) : (پرسیارم لە ئیبن و مەسعود کرد ووتم : کێ لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا بوو لە شەوی جنۆکەکەدا؟ فەرمووی : کەس لە ئێمە لەو شەوەدا لەگەڵی نەبووین بەڵکو ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین شەوێکیان نەمان بینیەوە و بەدوایدا گەڕاین لە دۆڵ و شیوەکاندا ووتمان کوژراوە و فڕێنراوە و شتی بەرامبەر کراوە، خراپترین شەوێکمان بەسەربرد کاتێ بەیانیمان بەسەردا هات بینیمان لای (حراء) ەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕایەوە پێمان ووت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕاین بە دواتا و نەمان دۆزیتەوە خراپترین شەومان بەسەربرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نوێنەری جنۆکەکان ئەمشەو هات بۆ لام ڕۆیشتم قورئانم بەسەردا خوێندنەوە) لەڕیوایەتێکی تردا فەرمووی : (( بتُ الليلة اقرأ على الجن رفقاء بـ ((الجحون))[٢٨٤] واتە : ئەم شەوم بەسەر برد لە هاوڕێیوتی (الجن) دا لە (حجون) قورئانم بەسەر دا خوێندن .

وە هەروەها دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی برد و شوێنی دانیشتن و جێی ئاگر کردنەوە کە یانی نیشان داین وە ئەوانیش لەو کاتەدا داوای خواردنیان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد بوو پێغەمبەریش(ﷺ)بەوانی فەرموو: هەموو ئێسکێك کە ناوی خوای لەسەر هێنرابێت ئەبێت بە پارچە گۆشتێکی قەڵەو و دەکەوێتە دەستی ئێوە، وە هەموو تەپاڵەیەکی ئاژەڵی موسوڵمانان دەبێت بە لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانتان بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە پاشەڕۆی ئاژەڵ و ئێسقان خۆتان پاك مەکەنەوە چونکە ئەوانە خواردنی برا جنۆکەکانتانە .... )[٢٨٥] .وەپێ دەچێت کە پێغەمبەر (ﷺ) لەو شەوەدا سورەتی (الرحمن)ی بەسەر ئەو جنۆکانەدا خوێندبێتەوە. لە جابیرەوە (ﷺ) دەفەرموێت :

---

[٢٨٤] اخرجه: ابن حبان (٦٣١٩)، وأحمد(٤١٦)،وأبويعلى (٤٧٤/٨) وقال محققه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٢٠٩) : اسناده: صحيح

[٢٨٥] اخرجه: مسلم ( ١٠٠٦)، ابن ابى شيبة (١٥٥/١)، الطيالسى (٤٧/١)، وابن خزيمة (٨٢)،النسائى في (التفسير) ( ٦٤٣) ، ابوداود (٨٥)، الترمذي (٣٢٨٥)، ابوعوانة (٢١٩/١)، البيهقي في (الدلائل) (١٠٨/١) و في (السنن الصغرى) (٣٩) ، ابن حبان (١٤٣٢)، و قال محققه: اسناده صحيح على شرط

(پێغەمبەر (ﷺ) هاتەدەرێ بۆلای هاوەڵانی و سورەتی (الرحمن)ی بەسەریاندا خوێند لەسەرەتا وە تا کۆتایی و ئەوان هەر بێ دەنگ بوون ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لقد قراتها على الجن ليلة الجن، فكانوا احسن مردوا منكم كنت كلما اتيت على قوله ( فباى آلاء ربكما تكذبان ) قالوا : لابشيء من نعمك ربنا نكذب فلك الحمد) واتە: ئەم سورەتەم خوێندەوە بەسەر جنۆکەکاندا، و جنۆکەکان لە ئێوە چاکتر وەڵامیان دایەوە ومن هەرکاتێ بگەیشتمایەتە ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾ (الرحمن: ١٣) (دەیان ووت : ئێمە هیچ شتێك لە نیعمەتەکانی تۆی پەروەردگار بە درۆ ناخەینەوە و سوپاس بۆ تۆ ) [٢٨٦].

وە هەروەها نوێنەرانی جنۆکە تاقم تاقم وەکو ووترا دوای ئەم بەسەرهاتانە هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاینی خوا کە بۆ جنۆکە و مرۆڤە پێیان بگەیەنێت وە جێ ی خۆشیەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بگیەنێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾ (الفرقان: ١).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ (الأنبياء: ١٠٧) واتە: بۆ هەموو جیهانەکانی مرۆڤ و جنۆکە : وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (سبأ: ٢٨) ، وە ئەمەش تایبەتمەندێکە لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە خوای گەورە پیێ بەخشیوە و نەی بەخشیوە بە هیچ کەس لە پێغەمبەرانی پێش خۆی .

لە جابیر و ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنهما) دەفەرموون: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (اعطيت خمساً لم يعطهن احد قبلي كان كل نبى يبعث الى قومه خاصة ، و ارسلت الى الخلق كافة ..... و ختم بي النبيون) .واتە: پێنج شتم پیێ بەخشراوە کە نەبەخشراوە بە هیچ کەسێ لە پێغەمبەرانی پێش خۆم ئەوان بۆ لای کە سانی تایبەتی خۆیان دەنێرران

---

مسلم ،و ضعفه الشيخ الألباني في(السلسلة الضعيفة )(١٠٣٨) من طريق البيهقي و ابن خزيمة و مسلم ، وصححه من طريق ابى داود و الترمذي: انظر (صحيح ابي داود ) (٧٧) و (صحيح الترمذي )(٢٥٩٦).

[٢٨٦] اخرجه:الترمذي (٣٢٩١)، الحاكم (٤٧٣/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي،البيهقي في (الدلائل) (٢٣٢/٢)، وحسنه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢١٥٠) و(صحيح الترمذي) (٢٦٢٤).

بـەلاّم مـن نێـرراوم بـۆلای هـەموو دروسـت کراوەکـانی خـوا.... وە پێغەمبەرایەتیـشم پـێ کۆتایی هاتووە) (٢٨٧).

بەم شێوەیە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە طائیف، ئـەوە بـوو خـوای گـەورە کەسـی ڕێنمویی نەکرد لە خەڵکی طائیف لەو کاتەدا، بەلاّم چاکترین نوێنەرانی جنۆکـەی ڕێنمویی کرد و سەفەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بووە مایەی ڕێنمویی کردنی جنۆکە و گەیاندنی ئیسلام پێیان . وە پێویستە بزانین گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەککە لـە ژێـر پـەنادانی یـەکێك لە سەرکردەکانی قورەیشدا بۆ ناو مەککە چونکە کەس بۆی نەبوو ڕێگە بە پێغەمبەر (ﷺ) بدات بێتەوە ناو مەککە لەبەر ئەوە وەکو لێـرەدا بـاس دەکرێـت داوای پـەنادانی لـە (مطعـم کـوڕی عـەدی) کـرد تـا پـەنای بـدات لـە قـورەیش بـۆ ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) بتوانێـت بگەڕێتەوە بۆ مەککە ...

ئیمـامی ئەمـەوی ( رحمـە الله) لـە مەغازییەکەیـدا دەفـەرموێت: ( ئینجا پێغەمبـەر (ﷺ) ئورەیقیطی نارد بۆلای ئەخنەسی کوڕی شـورەیق و داوای لێ کـرد بـۆ ئـەوەی پـەنای بـدات) ئەخنەس ووتی:من هاوپەیمانی قورەیشم هاوپەیمان ناتوانێت پەنای کـەس بـدات بەرانبـەر قورەیش، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) نـاردی بـۆلای (سـوهەیل) بـۆ ئـەوەی پـەنای بـدات، ئـەویش ووتی ئێمەی کوڕانی بـەنی عـامر نـاتوانین پـەنای کـەس بـدەین، بەرامبـەر کـوڕانی کـەعبی کوڕی لوئەی، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆلای مطعمی کوڕی عەدی بۆ ئەوەی پەنای بدات

ئەویش ووتـی: بـەڵێ بـچۆ بـە محمـد (ﷺ) بڵـێ : بابێـت، ئـەویش چـوو پـێ ی ڕاگەیانـد و پێغەمبەر (ﷺ) هات و ئەو شەوە لـە مـاڵی ئـەوان مایـەوە، کـە بەرەبـەیان بـووە وە خـۆیی و شەش یان حـەوت کوڕەکـەی (مطعـم) چواردەوری پێغەمبـەریان (ﷺ) گـردت تـا چـووە لای کەعبە و تەوافی کرد ، ئەوان پارێزگاریان لێ کرد و ئاگاداری قورەیـشیان کـردەوە کـە کـەس بۆی نی یە هیچ لە پێغەمبەر (ﷺ) بکات یان دەست بهینێتە ڕێی، ئـەبو سـوفیان تـوڕە بـوو چووە لای (مطعم) ووتی: تۆ باوەڕت پێ هێناوە یان پـەنات داوە، مطعـم ووتـی:پـەنام داوە، ووتی : حەقمان نی یە بەسەریەوە، بەو شێوەیە پێغەمبەر (ﷺ) تەوافی کرد و گەڕایەوە

---

(٢٨٧) اخرجه: البخاري (٣٣٥٠)، ومسلم (١١٦٣، ١١٦٧)، والترمذي ( ١٥٥٣)،والنسائي (٤٣٠)، وابن ماجة (٥٦٧).

بەرەوماڵەوە ) [٢٨٨] .

مطعم دوای ئەوە مرد، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم چاکەیەی ئەو پیاوەی ، قەت لە یاد نەچوو ئەوە بوو کاتێ باسی حەفتا دەست بەسەرەکەی جەنگی بەدر هاتە پێش ئا لەوێدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لو كان مطعم بن عدي حيا و كلمني في هؤلاء النتنى لتركتهم لـه) واتـە: (گەر مطعم زیندوو بوایە و قسەی لەگەڵم بکردایە و تکای ئازادکردنی بۆ ئەم دەست بەسەرە بۆگەنانە بکردایە هەر هەموویانم بۆئازاد دەکرد) [٢٨٩] ، کەواتە پێویستە موسوڵمانیش ئاوابێت هەتا بەرامبەر موشریکیش کەچاکەیەکی کردبێت بەرامبەری دەبێ بە وەفا بێت وەکو پێغەمبەر (ﷺ) .

# ئیسرا و میعراج

دوای ئەو هەموو دژواری و ناڕەحەتیەی هاتە پێش پێغەمبەر (ﷺ) لە پێناوی گەیاندنی ئیسلام بە خزمان و کەسانی خۆی لە قوڕەیش وە دوای ئەو هەموو ئازار و ڕێگریەی هاتە ڕێی لەلایەن دانیشتوانی مەککەوە و دوای سەفەرە دڵ تەزێن و پڕ زەحمەتەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجامیدا بۆ طائف، و هەڵوێستی دانشتوانی بەرامبەری دوای ئەو هەموو ڕووداوە خوای گەورە ڕێزی لە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) گرت ، و میوانداری کرد و ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، وە برا پێغەمبەرەکانی پێش خۆی نیشاندا و بەهەشت و دۆزەخ ... هتد، وە تا جبریل بە شێوەی خۆی ببینێت، وە نوێژی لەسەر فەرز بکات تاکو ئەمانە ببێتە هۆی پاکردنەوەی جەستە و دەروونی و ڕەواندنەوەی خەمەکانی، بەسەرهاتی ئیسرا و میعراج لە چەندین فەرموودەدا هاتووە، کە (صحیح)ن هەندێکیان بە درێژی و هەندێکیان بە کورتی، بەڵام لێرەدا هەوڵ دراوە سەرجەم ڕیوایەتەکانی(ئیسراو و میعراج) کۆبکرێتەوە، لەگەڵ هەوڵدانی (تەوفیق) لە نێوانیاندا و ڕێکخستنی فەرموودەکان، وە بەسەرهاتەکەش بەم جۆرە دەبێت:

---

(٢٨٨) انظر:البداية(٣/١٣٧)، وقال الحافظ في الفتح(٧/٣٢٤): اورده الفاكهي(اخبار مكة) بإسناد حسن مرسل.

(٢٨٩) اخرجه: احمد (٤/٨٠)، و البخاري (٤٠٢٤ )، والحميدى (٥٥٨ )، وابوداوود ( ٢٨٨٩)، والطبراني في (الكبير) (٢/١١٧) ، و ابو يعلي (٢/ ٣٤٩).

(ئەبو شیهابی زوهری) (ﷺ) دەفەرموێت: ( اسری رسول الله (ﷺ) إلى البيت المقدس قبل الهجرة بسنة )[٢٩٠] واتە : شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر (ﷺ) پێش کۆچ کردنی بۆ شاری مەدینە بە ساڵێك ، (ئیبن ئیسحاق) دەفەرموێت: ( پاشان شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر (ﷺ) لە (مسجد الحرام) ەوە بۆ (مسجد الأقصى) (واتە: شاری بیت المقدس یان ئیلیلیا) ئەمە کاتێك بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) ئیسلامی ڕاگەیاند بوو بەشاری مەککە وە بلاوبۆوە بەسەرجەم هۆزەکانی تردا )[٢٩١].

(ئیبن حەجەر) دەفەرموێت: ( پێغەمبەر (ﷺ) خەووتبوو لە ماڵی دایکی هانی، کە ماڵیان لای دۆلی ئەبو طالب بوو لەو کاتەدا لە سەقفەکەوە مەلائیکە دابەزین و پێغەمبەریان (ﷺ) لە ماڵ هێنایە دەر بۆ مزگەوت و لەوێ پێغەمبەر (ﷺ) پاڵی دایەوە، و وە نەوزی پێوە دیار بوو، ئەنجا مەلائیکە هینایانە دەرەوە بۆ دەرگای مزگەوت (واتە: لە نێوان خەوتن و نەخەوتندا بوو )[٢٩٢].

**ئێستاش سەرتاسەری ڕیوایەتەکانی ئیسرا و میعراج بەم جۆرە دەبێت (والله اعلم):-**

(ئەبو زەڕ) (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ( فرج عن سقف بيتي وانا بمكة فنزل جبريل (عليه السلام) )[٢٩٣] واتە: کاتێ لە مەککە بووم لە سەقفی ژوورەکەمەوە جبریل دابەزی .. لە ڕیوایەتێکی تردا (جاءه ثلاثة نفر) [٢٩٤] واتە: سێ کەس بوون، یەکێکیان جبریل بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا ( اذ سمعت قائلا يقول احد الثلاثة بين الرجلين فاتيت )[٢٩٥] واتە: گوێم لێ بوو یەکێکیان دەیووت:ئەو پیاوەیانە کە لە نێوان ئەو سێ پیاوەدا خەوتووە (واتە: پێغەمبەر (ﷺ))، لە ڕیوایەتێکی تردا (فلم يكلموه حتى احتملوه فوضعوه عند بئر زمزم فتولاه منهم جبريل ) واتە: قسەیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نەکرد وە هەڵیان گرت و

---

[٢٩٠] اخرجه: الذهبي في سير اعلام النبلاء (١/١٦٤) و (تاريخ الإسلام )( ٢٤١).

[٢٩١] اخرجه: سيرة ابن هشام (٢/٦)،و البداية (٣/١٣٦).

[٢٩٢] انظر : فتح الباري (٧/٢٠٤).

[٢٩٣] اخرجه: البخاري (٣٤٩)، ومسلم ( ٤١٣)،وابن ماجة (١٣٤٩).

[٢٩٤] اخرجه: البخاري (٣٥٧)، ومسلم ( ٤١٢).

[٢٩٥] اخرجه: البخاري (٣٥٧).

بردیان هەتاکو لای بیری زمزم لەوێ دایان نا و ئنجا ئەوان گەڕانەوە و جبریل لەوانی وەرگرت و مایەوە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)، لە ڕیوایەتێکی تردا ( بینما انا عند البیت ..)[٢٩٦] واتە: من کاتێك لای حیجری لای کەعبە بووم ..، لە ڕیوایەتێکی تردا (في الحطیم او الحجر مضطجعا بین النائم و الیقظان ) واتە: پاڵم دابووە لە نێوان حالەتێکی خەوتن و نەخەوتن دا بووم. لە ڕیوایەتێکی تردا ( فنزل جبریل (ﷺ) ففرج صدري .. )[٢٩٧] واتە: جبریل دابەزی و سنگی لەت کردم، لە ڕیوایەتێکی تردا ( من النحر إلى مراق بطني .. ) واتە: لە قوڕقوڕاگەوە هەتا کۆتایی سکم، ئەنجا تەشتێکی ئاڵتونی هێنا پڕ لە ئاوی زەمزەم بوو دڵی دەرهێنام و بە ئاوی زەمزەم شۆردیەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا (فاستخرج قلبي فغسل بماء زمزم بیده حتى انقى جوفه ثم اعید مکانه )[٢٩٨] واتە: دڵی دەرهێنام و و شۆردیەوە بە ئاوی زەمزەم پاشان هەموو هەناومی پاککردەوە، ئەنجا کردیەوە شوێنی خۆی، لە ڕیوایەتێکی تردا ( ثم جاء بطست من ذهب ممتلیء حکمة و ایمانا فافرغها في صدري .. )[٢٩٩] پاشان تەشتێکی ئاڵتوونی پڕ لە حیکمەت و ئیمانی هێنا و هەڵیڕێژایە ناو سنگمەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا (فحشها في صدري و لغادیده ثم اطبقه .. )[٣٠٠] .واتە: سنگم و هەموو دەمارەکانمی پڕکرد و پاشان سنگی لکاندمەوە بەیەکەوە.

پاشان لە ئەنەسەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (اوتیت بالبراق وهو دابة ابیض طویل فوق الحمار ودون البغل یضع حافره عند منتهى طرفه ..)[٣٠١] واتە: بوراقم بۆ هێنرا کە وڵاخێکی سپی و بەرز بوو لە گوێدرێژ بەرز تر بوو وە لە ئێستر نزمتر بوو، قاچی دادەنا لەو جێگەیەی تا چاوی بەدی دەکرد (واتە: هەنگاوی هەڵناوەتەوە بۆ ئەوسەر نێوان هەموو هەنگاوێکی مەودای بینینی چاو بووە ).

---

[٢٩٦] اخرجه: مسلم ( ٤١٥ ).

[٢٩٧] اخرجه: البخاري (٣٤٩)، و مسلم ( ٤١٣ ) .

[٢٩٨] اخرجه: مسلم ( ٤١٦ ).

[٢٩٩] اخرجه: البخاري (٧٥١٧).

[٣٠٠] اخرجه: البخاري ( ٣٤٩ )،ومسلم (٤١٣).

[٣٠١] اخرجه: البخاري ( ٧٥١٧ ).

لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە ئەنەسەوە ((أن النبی (ﷺ) اوتي بالبراق لیلة اسری به مسرجا ملجما لیرکبه فاستصعب علیه فقال له جبریل: (أبمحمد تفعل هذا) ما یحملك علی هذا فوالله مارکبك احد قط اکرم علی الله منه، فارفض عرقا )[٣٠٢] ئەنەس (ﷺ) دەفەرموێت: لەو شەوەدا کە خوای گەورە شەوڕەوی بە پێغەمبەر (ﷺ) کرد بوراقیان بۆ هێنا زین و لغاوکرابوو وە ئامادەکرا بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا سواری بێت و سواربوونی بەلایەوە ناڕەحەت بوو، جبریل بە بوراقی ووت: ئاوا دەکەیت بە پێغەمبەر (ﷺ) چی وات لێ دەکات وا بکەیت وەڵاهی هیچ کەسێك بەڕێزتر لای خوا لەم پیاوە سواری پشتت نەبووە ئەنجا بوراق لە شەرمدا ئارەقی دەرکرد. لە ڕیوایەتێکی تردا: ( فحملني علیه و معي صاحبی لایفارقني ....)[٣٠٣] پێغەمبەر (ﷺ) (ئەفەرموێت): سواری پشتی کردم و هاوەڵەکەم کە جبریلە لەگەڵمدا بوو لێم جیانەبووەوە .. لە ڕیوایەتێکی تردا: ((فحمله علیها جبریل، احدهما ردیف صاحبه(فرکبته حتی اتیت بیت المقدس)) واتە: جبریل سواری کردم و هەردووکمان سواری پشتی بووین تا بیت المقدس، لە ڕیوایەتێکی تردا:(لیلة اسري بي وضعت قدمي حیث توضع اقدام الأنبیاء من بیت المقدس..)[٣٠٤] لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێ کرا لەو جێگایەدا قاچم دانا کە پێغەمبەران (علیهم السلام) قاچیان دادەنا لە (بیت المقدس)، لە ڕیوایەتێکی تردا: (لما انتهینا إلی البیت المقدس قال: جبریل باصبعه فخرق به الحجر و شد به البراق .. )[٣٠٥] واتە: کاتێ کە گەیشتینە (بیت المقدس) جبریل وای لە بەردەکە کرد کونی کرد و بوراقەکەی پێ بەستەوە ...، لە ڕیوایەتێکی تردا: (في باب المسجد) [٣٠٦]. التي یربط الأنبیاء قال: ثم دخلت

---

[٣٠٢] اخرجه: عبدالرزاق (٣٧٢/٢)، واحمد (١٦٤/٣) و (٢٢٠٢٧)، والترمذي ( ٣١٣١)، وابن حبان (٤٦)، وقال محققه: اسناده صحیح، والبیهقي في (الدلائل)(٣٦٢/٢)، وصححه الشیخ الألباني في (صحیح الترمذي) ( ٢٥٠٣).

[٣٠٣] اخرجه: احمد (٤/ ٢٠٨)، والترمذي (٣٣٤٦)، وابن خزیمة ( ٣٠١)، والبیهقي في (الدلائل) (١٣٧٣/٢)، وصححه الشیخ الألباني في (صحیح الترمذي ) (٢٦٦٦).

[٣٠٤] اخرجه: احمد (١٠٨٣٠ )، وقال محققه الأرناؤوط : اسناده حسن.

[٣٠٥] اخرجه: الترمذي ( ٣١٣٢)، وقال الشیخ الألباني في (صحیح الترمذي )( ٢٥٠٤) :صحیح الإسناد.

[٣٠٦] اخرجه: ابن عساکر في تهذیب تاریخ دمشق (٣٨٥/١) ، وقال الذهبي في (سیر اعلام النبلاء) (١٨٢/١) و (تاریخ الاسلام) ( ٢٦٩) : حدیث حسن غریب.

المسجد فصليت فيه ركعتين ثم خرجت فجاءني جبريل (عليه السلام) بإناء من خمر و اناء من لبن ..) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: بوراقی بەستە بەو ئەڵقەیەی بە دەرگای مزگەوتەکەوە بوو کە پێغەمبەران (عليهم السلام) پێشتر پێیان ئەبەستەوە پاشان چوومە ناو مزگەوتەکەوە و دوو رکات نوێژم کرد پاشان چوومە دەرەوە و جبریل دوو قاپی بۆ هێنام یەکێکیان مەی تیا بوو ئەوی تریان شیر بوو، لە ریوایەتێکی تردا (و قدح من عسل) [٣٠٧]واتە: قاپێکیان هەنگوینی تیا بوو، لە ریوایەتێکی تردا ( فقيل لي خذ ايهما شئت، فاخترت اللبن ..) واتە: پێم ووترا بەئارەزووی خۆت کامەیانت ویست لێ یە هەڵی گرە منیش شیرەکەم هەڵبژارد ..، لە ریوایەتێکی تردا (فشربته فقال: جبريل (عليه السلام): اخترت الفطرة .. ) پاشان خواردمەوە و جبریل فەرمووی: فیطرەتت هەڵبژارد .. لە ریوایەتێکی تردا (اما لو انك اخذت الخمر غوت امتك) ثم عرج بنا الى السماء الدنيا .. )[٣٠٨] واتە: پێ ی ووتم ئەگەر تۆ ئارەقەکەت هەڵبژار دایە ئەوا ئومەتەکەت دوای تۆ گومڕا دەبوون ، پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی دونیا، لە ریوایەتێکی تردا ( ثم اخذ بيدي فعرج بي ) (*) [٣٠٩] واتە: دەستی گرتم و بەرزی کردمەوە، لە ریوایەتێکی تردا ( بينا انا قاعد اذ جاءني جبريل (عليه السلام)، فوكز بين كتفي، فقمت إلى شجرة فيها كوكرى الطير، فقعد في احدهما، وقعدت في الآخر فسمت وارتفعت حتى سدت الخافقين وانا اقلب طرفي ولو شئت ان امس السماء لمست فالتفت إلى جبريل كانه حلس لاطيء ..) [٣١٠] واتە: کاتێ من دانیشتبووم جبریل هات بۆلام و دەستێکی دا بەسەر هەردوو شانمدا و

---

[٣٠٧] اخرجه: الطبراني في (المعجم الصغير)(٧٥٨)، و صحح اسنادة الشيخ الالباني في (الاسراْوالمعراج) (٣٨) .

[٣٠٨] اخرجه: مسلم (٤٢٣).

* هنا عرجا الى السماء بالمعراج (والله تعالى اعلم) .

[٣٠٩] اخرجه: مسلم (٤١٣).

[٣١٠] اخرجه: ابو نعيم في الحلية (٣١٦/٢), والطبراني (الأوسط) (٦٢١١) ابن سعد (١١١/١), وابن عساكر في (تهذيب تاريخ دمشق) (٣٨٥/١), والبزار (٥٨) والبيهقي في (الشعب) ( ١٥٥ ),وقال الحافظ في (الفتح ) (١٩٨/٧) رجاله لابأس بهم الا انه مرسل،قال الذهبي في (سير اعلام النبلاء) (١٧١/١): اسناده جيد حسن,وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) ( ٢٣٨ ) : رواه البزار و الطبراني في الأوسط ورجاله رجال الصحيح, و أخرجه أيضاً: البغوي في (شرح السنة) (٣٦٨٢) وقال محققه : مرسل ، و إبن المبارك في (الزهد)( ٢٠٧) و قال محققه: مرسل و إسناده حسن .

هەستام چوومە لاى درەختێك كە وەك هێلانەى باڵندەى پێوە بوو، من دانیشتم لە یەكێكیاندا و ئەویش دانیشت لەوى تریاندا، ئەنجا بەرەو ئاسمان بەرز بوو وە تا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوامان لەبەرچاو نەما و منیش هەر سەیرم دەكرد و دەمڕوانى و ئەگەر بم ویستایە دەست لە ئاسمان بدەم دەستم لێ ئەدا، ئاوڕم دایەوە بەلاى جبریل دا و بینیم وەك پۆشاكێكى كۆن وابوو ....، لە ڕیوایەتێكى تردا : ( (وهو كالحلس البالى من خشية الله)[٣١١] فعرفت فضل علمه بالله علي فاستفتح جبريل فقيل: من انت؟ قال: جبريل، قيل ومن معك؟ قال: محمد، قيل: وقد بعث اليه؟ قال: (نعم) قد بعث اليه (فافتح)..) واتە: جبریلم بینى وەك پۆشاكێكى كۆن وابوو لە ترسى خوا و زانیم چەندە شارەزاترە بەخواى گەورە لەمن، جبریل داواى كردنەوەى دەرگاى ئاسمانى كرد، ووترا: كێیە؟ ووتى:جبریل، ووترا: كێیە لەگەڵتایە؟ ووتى: محمد، ووترا: ئایا پێغەمبەرایەتى پێ سپێراوە ؟ ووتى: بەڵێ، پەیامى پێغمبەرایەتى پێ سپێردراوە ، بیكەرەوە ...لە ڕیوایەتێكى تردا: (قال:(أي:خازن باب السماء) مرحبا به و لنعم المجيء جاء ففتح لنا .. )[٣١٢] . واتە:دواى ئەوە لێپرسراوەى دەرگاى ئاسمانى دونیا ووتى: مەرحەباى لێ بێت چاكترین جێگە ئەو جێگەیە ئەو بۆى دەچێ، ئەنجا دەرگاكەى بۆ كردینەوە ، لە ڕیوایەتێكى تردا :( فلما علونا السماء الدنيا فاذا رجل قاعد عن يمينه اسودة وعن يسار اسودة قال: فاذا نظر عن يمينه ضحك و اذا نظر عن شماله بكى .. ) واتە: كاتێ بەرز بوینەوە بە ئاسمانى دونیادا بینیم پیاوێك دانیشتبوو و هەندێك ڕەشایى هەبوو لەلاى ڕاستیەوە وە لەلاى چەپیشیەوە هەندێك ڕەشایى هەبوو كە تەماشاى لاى ڕاستى دەكرد پێدەكەنى و وە كە تەماشاى لاى چەپى دەكرد دەگریا.

لەڕیوایەتێكى تردا (قال:(أي جبريل) هذا ابوك آدم فسلم عليه، فسلمت عليه فرد السلام ثم قال: مرحبا بالإبن الصالح و النبي الصالح فرحب بي ودعا لي بخير . ) جبریل ووتى: ئەوە ئادەمى باوكتە سەلامى لێ بكە، منیش سەلامم لێ كرد و ئەویش وەڵامى دامەوە و ووتى: مەرحەبا و پێشوازى لە كوڕى چاك وە پێغەمبەرى چاك، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

---

[٣١١] اخرجه: البزار (٢/١١٦)،وقال الحافظ في (الكافي الشافي)(٣/١١٢): اسناده قوي،وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٤٦): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح،وحسنه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة )( ٢٢٨٩).

[٣١٢] اخرجه: مسلم ( ٤١٥).

پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم ...

لە ڕیوایەتێکی تردا ( قلت يا جبريل: من هذا؟ قال: آدم (عليه السلام)، وهذه الأسودة عن يمينه و عن شماله نسم بنيه فاهل اليمين منهم أهل الجنة، والأسودة التي عن شماله أهل النار، فاذا نظر قبل يمينه ضحك، واذا نظر قبل شماله بكى، ثم عرج بنا الى السماء الثانية فاستفتح جبريل (عليه السلام) فقيل: من أنت؟ قال: جبريل، فقيل: ومن معك؟ قال: محمد، فقيل: قد بعث إليه؟..)[٣١٣] ووتم: ئەی جبريل: ئەوە کێیە؟ ووتی: ئەوە ئادەمە (عليه السلام) و ڕەشاییەکانی لای ڕاست و چەپیەوە ڕۆحی نەوەکانی خۆیەتی، ڕەشاییەکەی لای ڕاستی یەوە ئەهلی بەهەشتن و ڕەشاییەکەی لای چەپی یەوە ئەهلی دۆزەخن کە تەماشای لای ڕاستی دەکات پێدەکەنی و کە تەماشای لای چەپی دەکات دەگری، پاشان بەرز کراینەوە بۆ ئاسمانی دووەم و جبريل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، ووترا: کێیە؟ ووتی:جبريل، ووترا: کێت لەگەڵ دایە؟ ووتی: محمد، ووترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە ؟ ووتی:بەڵێ ( (نعم) (قد بعث اليه) فقيل مرحبا به فنعم المجيء جاء قال: ففتح لنا .. ) [٣١٤] ووتی: بەڵێ، ووترا: پێشوازی و مەرحەبای لێ بێ بۆ چاکترین جێگا دەچێت و دەرگاکەمان بۆ کرایەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا ( (فلما خلصت) فاذا ابنى خالَ عيسى ابن مريم و يحيى بن زكريا (عليهما السلام) (قال: هذا يحيى و عيسى فسلم عليهما، فسلمت عليهما فردا، ثم قال: امرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح) فرحبا بي و دعوا لي بخير ثم عرج بي إلى السماء الثالثة ، فاستفتح جبريل فقيل: من انت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، قيل: وقد بعث اليه؟ قال: نعم بعث اليه ففتح لنا، فلما خلصت فاذا بيوسف (عليه السلام) و اذا هو قد اعطي شطر الحسن، قال:)، واتە: کاتێ چوومە ناو ئاسمانی دووەمەوە بینیم دوو خاڵۆزاکە یەحیا و عیسا (عليهما السلام)ی لێ بوو، جبريل ووتی: ئەوە یەحیایە و ئەوە عیسایە سەلامیان لێ بکە، منیش سەلامم لێ کردن و ئەوانیش وەڵامیان دامەوە و ووتیان: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: پێشوازیان لێ کردم و دوعای خێریان بۆ کردم پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی سێهەم، و جبريل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، ووترا: کێیە؟ ووتی:جبريل، ووترا:کێت لەگەڵ دایە؟ ووتی: محمد، ووترا ئایا پەیامی

---

[٣١٣] اخرجة : مسلم (٤٠٣) .

[٣١٤] اخرجه: البخاري ( ٣٨٨٧)، ومسلم (٤١٥).

بۆ نێرراوە ؟ ووتی: بەڵێ، وە کاتێ چوومە ئاسمانی سێهەم یوسفم بینی کە نیوەی جوانی پێ بەخشرابوو .. لە ڕیوایەتێکی تردا:

((هذا یوسف فسلم علیه، فسلمت علیه فردّ، ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح) قال: فرحب بي ودعا لي بخير ثم (عرج بي) الى السماء الرابعة، فاستفتح جبريل فقيل: من انت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، قيل: وقد بعث اليه؟ قال: (نعم) بعث اليه، ففتح لنا فاذا (بادريس (عليه السلام) قال: هذا ادريس فسلم عليه، فسلمت عليه فردّ، ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح) قال: فرحب بي ودعا لي بخير، قال الله عزوجل :[ورفعناه مكانا عليا ] ثم عرج بنا الى السماء الخامسة، فاستفتح جبريل فقيل: من انت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، قيل: وقد بعث اليه؟ قال: (نعم)....).

جبریل ووتی: ئەوە یوسفە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و ووتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی چوارەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، ووترا: کێیە؟ ووتی: جبریل، ووترا: کێت لەگەڵ دایە؟ ووتی: محمد، ووترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە ؟ ووتی: بەڵێ، پاشان دەرگاکەی بۆ کردینەوە، چووم تەماشام کرد ئیدریسم بینی، جبریل ووتی:ئەوە ئیدریسە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و ووتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم، خوای گەورە فەرموویەتی: ( ورفعناه مكانا عليا ) واتە: بەرزمان کردەوە بۆ جێگەیەکی بەرز ، پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، ووترا: کێیە؟ ووتی: جبریل، ووترا: کێت لەگەڵ دایە؟ ووتی: محمد، ووترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ ووتی: بەڵێ. دەفەرموێت:

(قد بعث اليه، ففتح لنا فاذا انا بهارون (عليه السلام) (قال: هذا هارون فسلم عليه، فسلمت عليه فردّ، ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح) قال: فرحب بي ودعالي بخير، ثم عرج بنا الى السماء السادسة، فاستفتح جبريل فقيل: من انت؟ قال: جبريل، قيل: ومن معك؟ قال: محمد، قيل: (وقد بعث اليه؟ قال: (نعم) بعث اليه، ففتح لنا فاذا انا بموسى (عليه السلام)(قال: هذا موسى فسلم عليه، فسلمت عليه فردّ، ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح) قال: فرحب بي ودعالي

بخير ..).واتە: پاشان دەرگای بۆ کردینەوە و هارونم بینی (عليه السلام) جبريل ووتی: ئەوە هارونە بچۆ سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و هارونیش وەڵامی دامەوە و ووتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم، پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی شەشەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، ووترا: کێیە؟ ووتی:جبريل، ووترا:کێت لەگەڵ دایە؟ ووتی: محمد، ووترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ ووتی:بەڵێ، پاشان دەرگاکەی بۆ کردینەوە، چووم تەماشام کرد موسا لەوێیە ، جبريل ووتی: ئەوە موسایە، سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە،و ووتی: مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: پێشوازی لێ کردم و دوعای خێری بۆ کردم .

وفي رواية: ( فلما جاوزته بكى، فنودي: ما يبكيك؟ قال: يارب هذا غلام بعثته بعدى..) واتە: کاتێ ویستم بەجێی بێهڵم و کەمێك لێی دوور کەوتمەوە دەستی کرد بە گریان، بانگی لێ کرا: چی خستیتیە گریان ؟ ووتی:ئەی پەروەردگار کورێکت ناردووە دوای من، ( يدخل من امته الجنة اكثر مما يدخل من امتي ..) واتە: ئومەتەکەی ئەو زیاتر دەچێتە بەهەشتەوە لەچاو ئومەتەکەی مندا .... پاشان بەرزکراینەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم و جبریل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، ووترا: کێیە؟ ووتی:جبريل، ووترا: کێت لەگەڵ دایە؟ ووتی: محمد، ووترا ئایا پەیامی بۆ نێرراوە؟ ووتی: بەڵێ، پاشان دەرگاکەی بۆ کردینەوە، تەماشا دەکەین ئیبراهیمە و پاڵی داوە بە (بيت المعمور)ەوە، وفي رواية: ( قلت يا جبريل ماهذا؟ قال: هذا البيت المعمور يدخله كل يوم سبعون الف ملك اذا خرجوا منه لم يعودوا فيه آخر ما عليهم ) ووتم ئەی جبریل: ئەوە چی یە؟ ووتی: ئەوە (بيت المعمور)ە هەموو رۆژێك حەفتا هەزار مەلائیکە دەچنە ناویەوە و کە هاتنە دەرەوە هەتا کۆتایی دونیا ناگەرێنەوە ناوی .

وفي رواية: ( ثم لايعودون اليه حتى تقوم الساعة .. ) واتە: ئەو حەفتا هەزار مەلائیکەیە دەچنە ناوی و پاشان ناگەرێنەوە ناوی تا قیامەت بەرپادەبێ .

و في رواية ( قال: (قلت من هذا؟) قال: هذا ابوك أبراهيم فسلم عليه فسلمت عليه، فرد ثم قال: مرحبا بالإبن الصالح و النبى الصالح ثم ذهب بي الى سدرة المنتهى ... )[٣١٥] واتە:

---

[٣١٥] اخرجه: البخاري ( ٣٨٨٧) ، ومسلم ( ٤١٣).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە کێیە پاڵی داوەتەوە ؟ جبریل ووتی: ئەوە ئیبراهیمی باوکتە بچۆ سەلامی لێ بکە منش سەلامم لێ کرد ئەویش وەلامی دامەوە و ووتی: مەرحەبا و پێشوازی لە کوڕی چاك و پێغەمبەری چاك ، و في رواية ( ليلة اسرى بي مررت بابراهيم (الطَّيِّلا) فقال: يا جبريل من هذا معك؟ قال: محمد، فسلم عليَ ورحب بي و قال: يا محمد أقرىء أمتك منى السلام، واخبرهم أن الجنة طيبة التربة عذبة الماء (و ارضها واسعة) وانها قيعان و ان غراسها:(سبحان الله و الحمدلله و لااله الاالله و الله اكبر (و لاحول ولا قوة الا بالله)) ) .

واتە: ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا تێپەڕیم بەلای ئیبراهیمدا (الطَّيِّلا) و ووتی: ئەی جبریل ئەوە کێیە لەگەڵتدا؟ ووتی: ئەوە موحەممەدە، ئیبراهیمیش سەلامی لێ کردم و پێشوازی لێ کردم و ووتی: ئەی محمد سەلامی من بگەیەنە بە ئومەتەکەت وە هەواڵیان پێ بگەیەنە کە بەهەشت خاکەکەی بەپیتە و ئاوەکەشی سازگارە و خاکەکەشی زۆر فراوانە و چێنراوەکانی: (سبحان الله و الحمدلله و لااله الاالله و الله اكبر (و لاحول ولا قوة الابالله)يە (واتە: ئەگەر بتەوێت ڕووەکت بۆ بڕوێت بەووتنی ئەم یادانە دەڕوێت) پاشان برام بۆلای (سدرة المنتهى)، ( اليهما ينتهي ما يعرج به في الأرض فيقبض منها،و اليها ينتهي ما يهبط به من فوقها فيقبض منها ...) [٣١٦] .واتە: ئەوە (سدرة المنتهى) یە ئەوەیە هەر شتێك لە زەویەوە بەرز بێتەوە تا ئەوێ دەگات و پاشان لەوی وەردەگیرێت و بەرز دەکرێتەوە، وەهەر شتێکیش لە سەرەوە بێت هەتا ئەوێ دێتە خوارەوە و لەوێ وەردەگیرێت (دەفەرموێت:) فەرمانێك لە فەرمانەکانی خوای گەورە گرتیەوە و ڕواڵەتی (سدرة المنتهى) گۆڕرا هەتا هیچ کەس لە دروست کراوەکانی خوا ناتوانێت وەسفی بدات لە جوانیدا ... (فإذا نبقها مثل قلال هجر و إذا ورقها مثل أذان الفيلة) و قال: (أي: جبريل): هذه سدرة المنتهى....)[٣١٧] واتە: بەری داری (النبق)کە وەکو گۆزە گەورەکانی هەجەر وابوو وە گەڵاکانی وەکو گوێچکەی فیل گەورەبوو، جبریل ووتی: ئەوە (سدرة المنتهى) یە .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ( تەماشام کرد (لە بنەکەیدا) چوار ڕووبار هەبوو دووانیان داپۆشرابوون و دووانیان ئاشکرا بوون، ووتم: ئەی جبریل ئەوە چی یە؟ ووتی:ئەو دوو

---

[٣١٦] اخرجه: مسلم ( ٤٣٠).

[٣١٧] اخرجه: البخاري (٣٨٨٧) .

ڕووبارە کە داپۆشراوە (واتە: لە ناو بەهەشت) دوو ڕووبارن لە بەهەشتدا وە دوو ڕووبارە ئاشکراکەش(واتە: لە دەرەوەی بەهەشت) نیل و فوراتە، ئنجا پەرداخێ شەراب وپەرداخێ شیر و پەرداخێ هەنگوینیان هێنا و منیش شیرەکەم هەڵبژارد و جبریل ووتی:ئەوە فیطرەتی پاکت هەڵبژارد کە ئومەتەکەت لەسەر ئەو فیطرەتە پاکە دەمێنێت ) .

لە ڕیوایەتێکی تردا: (ئیبن مەسعود) (رضي الله عنه) ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ( رأيت جبريل (عليه السلام) عند السدرة له ستمائة جناح يتناثر (من ريشة) تهاويل الدر (و الياقوت) ) [٣١٨] .

واتە: جیبریلم بینی لای سیدرە کە شەش سەد باڵی هەبوو کە دەیجوڵاندن جۆراوجۆر دوڕ و یاقووت لە باڵەکانی دەباری....

و في رواية: ( رأى (النبي (ﷺ)) جبريل (عليه السلام) في حلة من رفرف قد ملء ما بين السماء و الأرض ) [٣١٩] . واتە: پێغەمبەر (ﷺ) جبریلی بینی لە بەرگێکی ڕەفرەف دا لە نێوان زەوی و ئاسماندا (واتە نێوانی زەوی و ئاسمانی گرتبوو) .. و في رواية: (قد سد الأفق ) [٣٢٠] واتە: ئاسۆی ئاسمانی داپۆشیبوو لە گەورەییدا، و في رواية: ( لما أسري برسول الله (ﷺ) انتهى به الى سدرة المنتهى ـ و اعطي ... وخواتيم سورة البقرة، و غفر لمن لم يشرك بالله من امته شيئا المقحمات ) .

واتە: ئیبن و مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) شەوڕەوی پێ کراو گەیشتە (سدرة المنتهى) لەوێ خوای گەورە کۆتایی سورەتی (البقرة)ی پێ بەخشی و خۆش بوو لە تاوانە گەورەکانی ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار نەداوە لە ئومەتەکەی .

---

(٣١٨) اخرجه: احمد (١/٤١٢)، والطبري (٢٧/٢٩)، والنسائي في (التفسير)(٥٥١) و قال محققه : اسناده حسن،وقال ابن كثير في (التفسير) (٦/٢٣) : اسناده جيد قوي والتفسير ايضا قال في (٦/٢٤):اسناده حسن، وابن حبان (٥٤ –٦٤٢٨) ، وقال محققه : سنده حسن،و الطبراني في (الكبير)( ٩٠٥٤)،وانظر (الإسراء و المعراج) للشيخ الألباني(١٠٢).

(٣١٩) اخرجه: الترمذي (٣٢٨٣)، والنسائي في (التفسير) (٥٥١ )، قال محققه : اسناده صحيح، واحمد (١/٣٩٤)، والطيالسي (٣٢٣)،وابو يعلى( ٥٠١٨) ، والطبراني في (الكبير) (٩٠٥٠)،والحاكم (٢/٤٦٨) و صححه على شرط الشيخين و وافقه الذهبي،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي )(٢٦١٧).

(٣٢٠) اخرجه: النسائي في (التفسير )(٥٦٠) و قال محققه : صحيح.

لەڕیوایەتێكی تردا:-(ثم دخلت الجنة فإذا فيها جنابذ اللؤلؤ واذا ترابها المسك) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: پاشان چوومە ناو بەهەشتەوە بینیم تەپۆڵكەی مرواری تیدا بوو وە دەستم لە خاكەكەیەوە دا میسك بوو دەفەرموێت:

( رأيت نهرا في الجنة حافته قباب اللؤلؤ، قلت: ما هذا يا جبريل قال: هذا الكوثر الذي أعطاكه الله ) واتە: ڕووبارێكم بینی لە بەهەشتدا هەردوولای مرواری بوو، ووتم: ئەوە چی یە ئەی جبریل؟ ووتی: ئەوە ئەو كەوسرەیە خوای گەورە پێی بەخشیویت ، و في رواية: ( ثم عرج بي حتى ظهرت لمستوى أسمع فيه صريف الأقلام ) پاشان بەرز كرامەوە ( دیارە لە بەهەشتەوە (والله أعلم )) تا گەیشتمە ئاستێك كە گوێم لە دەنگی قەڵەمەكان بوو (واتە: نەقڵ كردنی زانیاریەكان لە (لوح المحفوظ) ەوە لەلایەن مەلائیكەوە) (والله اعلم) .

((و فتح لي باب من ابواب السماء و رأيت النور الأعظم و إذا دون الحجاب رفرفة الدرّ و الياقوت) فأوحى الله اليَ ما أوحى ففرض عليَ خمسين صلاة في كل يوم و ليلة ، فنزلت الى موسى(عليه السلام) فقال: ما فرض ربك على أمتك؟ قلت:) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: گەیشتمە ئەوێ دەرگایەكم بۆ كرایەوە لە دەرگاكانی ئاسمان، نوری هەرەگەورەم بینی كە پەردەیەكی شەكاوەی دوڕ و یاقووتی هەبوو لە نزیك (الحجاب) وە پاشان خوای گەورە ئەو وەحیەی خۆی ویستی لێ بوو بۆی ناردم لەوێ ئەنجا پەنجا نوێژی لەسەرم فەرزكرد لە هەموو شەو و ڕۆژێكدا، پاشان گەڕامەوە و دابەزیم تا گەیشتمە لای موسی(عليه السلام) و پێی ووتم: خوا چی فەرزكرد لەسەر ئومەتەكەت؟ منیش ووتم: ((فرض عليهم)) [٣٢١] خمسين صلاة، قال: إرجع الى ربك فاسأله التخفيف فإن امتك ..)) وتم: پەنجا نوێژی لەسەر فەرز كردم، موسا ووتی: بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت داوای سوك كردنی لێ بكە بۆ ئومەتەكەت چونكە ئومەتەكەت في رواية (... لا تستطيع خمسين صلاة .....) ناتوانن پەنجا نوێژ بكەن، (وإني والله جربت الناس من قبلك و عالجت بني اسرائيل أشد المعالجة فارجع إلى ربك فأساله التخفيف لأمتك ..) واتە: وەڵاهی من خەڵكانم پێش تۆ تاقی كردۆتەوە و زۆر كۆششم كرد لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت داوای سوك كردنی لێ بكە بۆ ئومەتەكەت،

---

[٣٢١] اخرجه: مسلم ( ٤١٤ ).

(دوای ئەوە موسا (عليه السلام) پێی ووتەوە) . في رواية: (يا محمد والله لقد راودت بني اسرائيل قومي على أدنى من هذا فضعفوا فتركوه فأمتك أضعف أجسادا و قلوبا و ابدانا و أبصارا و اسماعا) .

واتە: ئەی محمد وەڵاهی لەوە کەمتر لە بەنی ئیسرائلی خزمانی خۆم داواکرد کەچی بێ هێز بوون بەرامبەری و ئەنجامیان نەدا ئومەتەکەی تۆ جەستە و دڵ وچاو و گوێیان زۆر لاوازترە لە ئومەتی من، پێغەمبەر (ﷺ) دوای پێشنیارەکەی موسا(عليه السلام):( فالتفت النبي(ﷺ) الى جبريل كأنه يستشيره في ذلك، فأشار اليه جبريل: أن نعم إن شئت فعلا به الى الجبار فقال: يا رب خفّف عنا فإنا لانستطيع هذا ) .

واتە:ئاورێکی دایەوە بەلای جبریل دا وەك ئەوەی ڕاوێژی پێ بکات، جبریل ئاماژەی بۆ کردو ووتی: بەڵێ ئەگەر پێت خۆشە ئەتوانیت بگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگارت،دەفەرموێت: بەرزی کردمەوە بۆلای خوای گەورە هەتا ووتم: ئەی پەروەردگار سوکی بکە لەسەرمان ئێمە ئەوە ناتوانین ...( فوضع عني عشرا فرجعت إلى موسى فقال مثله، فرجعت فوضع عني عشرا، فرجعت إلى موسى فقال: مثله، فرجعت فوضع عني عشرا، فرجعت إلى موسى فقال مثله، فرجعت فامرت بعشر صلوات كل يوم، فرجعت فقال: مثله، فرجعت فأمرت بخمس صلوات، فرجعت إلى موسى، فقال: بما امرت؟ قلت: بخمس صلوات كل يوم، قال: إن امتك لاتستطيع خمس صلوات كل يوم، واني قد جربت الناس قبلك و عالجت بني اسرائيل أشد المعالجة فارجع إلى ربك، فاسأله التخفيف لأمتك، قال سألت ربي حتى أستحييت )[٣٢٢] .

دەفەرموێت: خوای گەورە (دە) نوێژی لەسەر لابردم و گەڕامەوە بۆلای موسا، و هەمان قسەی یەکەم جاری پێ ووتمەوە، و منیش گەڕامەوە بۆلای پەروەردگار تا دە نوێژی تری لەسەر لابردم پاشان گەڕامەوە بۆلای موسا و هەمان قسەی یەکەم جاری پێ ووتم، منیش گەڕامەوە بۆلای پەروەردگار و (دە) نوێژی تری لەسەر لابردم و پاشان فەرمانم بە دە نوێژ پێ کرا لە هەموو ڕۆژێکدا و گەڕامەوە و موسا هەمان قسەی یەکەم جاری پێ ووتمەوە، و گەڕامەوە و پێنج نوێژم لەسەر فەرز کرا و پاشان گەڕامەوە بۆلای موسا ووتی:فەرمانت بە چی پێ کراوە؟ ووتم: بە پێنج نوێژ لە هەموو ڕۆژێکدا، موسا ووتی: ئومەتەکەت ناتوانن پێنج نوێژ لە هەموو ڕۆژێکدا بکەن و من خەڵکانم لە پێش تۆدا تاقی

---

[٣٢٢] اخرجه: البخاري (٣٨٨٧).

کردۆتـــەوە و کۆشـــشێکی زۆرم لەگـــەڵ بـــەنی ئیـــسرائیل دا کـــردووە، بگـــەڕێرەوە بـــۆلای پـــەروەردگارت و داوای لێ بکـــە تـــا ســـووکی بکـــات لەســـەر ئومەتەکـــەت، پێغەمبـــەر (ﷺ) دەفەرموێت: منیش ووتم: ئەوەندەم داوا کردووە شەرم دەکەم (من ربي مما اختلف اليـه) و لكن أرض و أسلم، قال: فلما جاوزت نادى منادٍ: أمضيت فريضتي و خففت عن عبادي يا محمد إنهن خمس صلوات كل يوم و ليلة لكل صلاة عشر فذلك خمسون صلاة) .

واتە: شەرم دەکەم لە پەروەردگارم ئەوەنـدە گەڕاومەتـەوە بۆ لای بـەڵام ڕازی دەبم بـەو پێنج فەرزە و دەفەرموێت: کە موسام بەجێ هێشت و لێ ی دوور کەوتمەو بـانگم لێ کـراپێم ووتـرا:ئەوا ووتەی خۆمم بردە سەر وئەرکم لەسەر بەندەکانم سوك کرد ، ئەی محمد ئەوانە پێنج نوێژە لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا و هەموو نوێژێك دەیە و ئەوە پـەنجا نوێـژە (لايبـدل القول لدي)[٣٢٤]، ومن هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة، فإن عملها كتبت لـه عـشراً، و مـن هم بسيئة فلم يعملها،لم تكتب شيئاً، فإن عملها كتبت سيئة واحـدة ) فـەرمووی: ووتـە لای مـن ناگۆڕێـت و هـەر کەسـێك نیـازی کردنـی چـاکەیەکی هـەبێت و نـەیکات چـاکەیەکی بـۆ دەنوسرێت، و گەر ئەنجامی بدات دە چاکەی بۆ دەنوسرێت، و هەر کەسێك نیازی تـاوانێکی هەبێت و نەیکات هیچی لەسەر نانوسرێت، و گەر ئەنجامی بـدات ئـەوا یـەك تـاوانی لەسـەر دەنوسرێت، وە دوایی خوای گەورە فەرمووی: ( قال: فاهبط بسم الله ) واتە: دابەزە بـەناوی خواوە .

(ئیبن کثیر) دەفەرموێت :( پاشان دابەزی بۆ بيت المقدس و پێغەمبـەرانیش (عليهم السلام) دابەزین لەگەڵیدا و کاتی نوێژ هات و(پێ دەچێت نوێـژی بـەیانی بووبێـت) پێغەمبـەر (ﷺ) پێش کەوت و پێش نوێژی بۆ کردن .....) [٣٤٢] سەبارەت بە پێش نوێژی کردنـی پێغەمبـەر (ﷺ) بـۆ ئـەو پێغەمبـەرە بەڕێزانـە (علـيهم الـسلام) ئـەبو هـورەیرە (ﷺ) دەفـەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((وقد رأيتني في جماعة من الأنبياء فإذا موسى قائم يصلي فـإذا رجـل جعد...))[٣٢٥] .واتە: ئەتبینم لەناو کۆمەڵێك پێغەمبەراندا بـووم و موسـا لـە نێوانیانـدا بـوو

---

[٣٢٣] اخرجه: مسلم ( ٤١٤).

[٣٤٢] انظر: تفسير القرآن العظيم (٣/٤٩١) .

[٣٢٥] اخرجه: مسلم ( ٤٢٩).

بەرچاوم کەوت نوێژی دەکرد بە پێوە پیاوێکی چوار شانەی بەخۆوە بوو،لە ڕیوایەتێکی تردا(آدم طوال)[٣٢٦] واتە: بالآبەرز بوو ( رجله الراس) واتە: پێست وە سپی یەکی قژلولی قژ داهێنراوبوو ( كأنه من رجال شنؤة، وإذا عيسى بن مريم (عليه السلام) قائماً يصلي...)[٣٢٧] واتە: دەتووت یەکێکە لە پیاوانی شنوئەی عومان وە عیسای کوڕی مەریەم بەرچاو کەوت بە پێوە نوێژی دەکرد لە ڕیوایەتێکی تردا ( حديد البصر.... )[٣٢٨] واتە: پیاوێکی چاو تیژ بوو.

لە ڕیوایەتێکی تردا ( مربوع الخلق الى الحمرة و البياض سبط الرأس )[٣٢٩] واتە: چوار شانەیەکی سوروسپی قژ خاو بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا ( كأنه خرج من ديماس فإذا أقرب الناس به شبهاً عروة بن مسعود الثقفي، و إذا إبراهيم (عليه السلام) قائم يصلي أشبه الناس به صاحبكم (يعنى نفسه) فحانت الصلاة فأممتهم فلما فرغت من الصلاة قائل يقول: يا محمد هذا مالك صاحب النار فسلم عليه، فالتفت إليه فبدأني بالسلام )[٣٣٠] .

واتە: دەتووت لە حەمام هاتۆتە دەر و نزیکترین کەس بەو عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی یە، وە ئیبراهیمم بینی بە پێوە نوێژی دەکرد، نزیکترین کەس بەئەو هاوەڵەکەی خۆتانە (واتە: پێغەمبەر (ﷺ)) کاتی نوێژ هات پێش نوێژیم بۆ کردن کە نوێژەکە تەواو بوو یەکێ پێی ووتم: ئەوە مالیکی دەرگاوانی دۆزەخە سەلامی لێ بکە؟ کە ئاوڕم دایەوە ئەو لە پێش مندا سەلامی لێ کردم. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (ثم أقيمت الصلاة فأممتهم ثم انصرفنا فأقبلنا .....)[٣٣١].واتە: پاشان قامەت کرا و پێش نوێژیم بۆ کردن و لەوێ هاتینە دەرەوە و گەڕاینەوە.

---

[٣٢٦] اخرجه: مسلم ( ٤١٨ ).

[٣٢٧] اخرجه:مسلم ( ٤٢٣ ).

[٣٢٨] اخرجه: احمد (٣٥٤٦) وصحح اسنادة كل من: احمد شاكر وشعيب الأرنؤوط ، وحسنة الشيخ الالباني في (الاسرا والمعراج) (ص:٧٦)

[٣٢٩] اخرجه: مسلم(٤١٨).

[٣٣٠] اخرجه: مسلم( ٤٢٣ ).

[٣٣١] اخرجه: ابن عساكر في (تهذيب تاريخ دمشق )( ٣٨٦/١)، وقال الذهبي في (سير أعلام النبلاء) ( ١٨٢/١) و في (تاريخ الإسلام )(٢٦٩/١): حديث حسن غريب.

لە (ئیبن عەباسەوە) (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ( أسرى برسول الله (ﷺ) إلى البيت المقدس...... و رأى الدجال في صورتة رؤيا العين ليس برؤيا المنام و عيسى و موسى و إبراهيم، و سئل النبي (ﷺ) عن الدجال فقال: رأيته فيلمانياً أقمر هجان إحدى عينيه قائمة كأنها كوكب دريّ كان شعر رأسه أغصان شجرة ) واتە: شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بیت المقدس و لەوێ دەجالی بینی لە شێوەی خۆیدا و بە چاوی خۆی بی ئەوەی خەوتبێت ، عیسا و موسا و ئیبراهیمیشی بینی و پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی دەجال؟ فەرمووی: پیاوێکی بەخۆی چوار شانەی زۆر سپیکەلە بوو یەکێ لەچاوەکانی زەق و دەر پۆ ڤیوبوو وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار وابوو، وە مووەکانی قژی وەك پەلەکانی درەخت وابوو. بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە دەبێت لەو شەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ پێغەمبەر عیساو موسادا (عليهما السلام) کەوتونەتە باسکردنی دەجال و چۆنێتی هاتنی و کوشتنی لەلایەن پێغەمبەر عیساوە کە چۆن دادەبەزی و دەیکوژێت ئەو ڕیوایەتە (ضعیف)ە [٣٣٢]. ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (..... ثم انصرف بي فمررنا بعير لقريش بمكان كذا و كذا قد أضلوا بعيراً لهم قد جمعهم فلان، فسلمت عليهم، فقال: بعضهم: هذا صوت محمد (ﷺ) ثم أتيت أصحابي قبل الصبح بمكة ...)[٣٣٣]

واتە: پاشان گەڕامەوە وتێپەڕیم بەلای کاروانێکی قورەیشدا لەجێگەی فلان و فلان شوێندا بوون ووشترێکیان لێ وون بوو بوو وە فلانە کەس گرتبوویەوە بۆیان و منیش سەلامم لێ کردن و هەندێکیان ووتیان:ئەوە دەنگی محمدە، ئەنجا گەڕامەوە بۆلای هاوەڵەکانم پێش بەرەبەیان لە شاری مەککە ..

---

(٣٣٢) اخرجه: أحمد (١/٣٧٥)، و ابن ماجة( ٤٠٨)، و ابن أبي شيبة (١٥/١٥٨)،والطبري في (التفسير) (١٧/٩١)، و الحاكم (٤/٤٨٨) و صححه و وافقه الذهبي، و أبو عمر الداني في (السنن الواردة في الفتن) (٥٢٩) و ضعفه محققه، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف سنن ابن ماجة)( ٨٠٠).

(٣٣٣) اخرجه: الطبراني في (الكبير)( ٧١٤٢)،والبزار(١/٣٥)،والبيهقي في (الدلائل)( ٢/٣٥٥)وقال إسناده صحيح .

# گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ئیسراومیعراج

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرە شکۆدارەکەی لای خوای گەورە و میهرەبان، ئەوەبوو نیشانە گەورەکانی دەسەڵاتەی خوای گەورەی بینی، لەگەڵ بینی ئاسمانەکان و فریشتەکانی خوای گەورە و جبریل....، وە پێغەمبەر (ﷺ) باش دەیزانی کە بگەڕێتەوە لای کافرەکانی قورەیش ئەوان دەمەقاڵەدەکەن و باوەڕی پێناهێنن و بە درۆشی دەخەنەوە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لەوبەرەبەیانەدا کە گەڕایەوە بە کزۆڵەیی و دوور لە خەڵکان دانیشتبوو .

ئیبن عباس (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(( لما كان ليلة اسرى بي، ثم اصبحت بمكة، فظعت بامري، وعرفت ان الناس مكذبي ..))

واتە: ( پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: کاتێ خوای گەورە شەوڕەوی پێ کردم و گەڕامەوە و بەیانیم بەسەردا هات لەمە ككە زۆر دەترسام لەم کارەم و دەمزانی کە خەڵکان بە درۆم دەخەنەوە،(ئیبن عەباس دەفەرموێت:): پێغەمبەر (ﷺ) دوور لە خەڵکان دانیشتبوو بە غەم و پەژارەوە، و دوژمنی خوا ئەبو جەهل بەلایدا تێپەری و هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وەکو گاڵتە جاڕەی پێ کردنێك بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: چی یە هیچ بووە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:بەڵێ ئەم شەو شەوڕەویم پێ کراوە، ووتی:بۆ کوێ؟ فەرمووی: بۆ بیت المقدس، ووتی:هەر ئەم شەو چویتە ئەوێ و گەڕایتەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ،(ئیبن عباس دەفەرموێت:): ئەبو جەهل پێی باش نەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) بەدرۆ بخاتەوە نەوەك گوایە پێغەمبەر (ﷺ) قسەکەی بگۆڕێت کاتێ کە خزمانی لێ ی کۆبنەوە و بەوانی ڕانەگەیەنێت، لەبەر ئەوە بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت :

ئایا ئەوەی بۆ منت گێڕایەوە بۆ خزمانتی دەگێڕێتەوە ئەگەر کۆیان کەمەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، ئەبوجەهل هاواری کرد: هۆ کوڕانی کەعبی کوڕی لوئەی وەرن بۆ ئێرە ، هەموو کۆڕ و کۆمەڵی چوار دەوری کەعبە و شوێنە گرنگەکان هەموو چۆڵ بوون و هەموویان هاتن بۆلای ئەبو جەهل و کۆبونەوە و دوای ئەوە ئەبوجەهل بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: ئەوەی بۆ منت گێڕایەوە بۆ ئەوانیشی بگێڕەرەوە ، پێغەمبەر (ﷺ)

بەوانی فەرموو: ((من ئەمشەو شەوڕەویم پێ کراوە))، ووتیان: بۆ کوێ؟ فەرمووی: (بۆ بیت المقدس)، ووتیان:هەر ئەم شەو لەناوماندا ڕۆیشتیت و بەیانی یەکەی گەڕایتەوە ناومان؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، ئەنجا کافرەکان هەندێك دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و هەندێکیشیان دەستیان دا بەسەریاندا (گوایە ووتیان: ئەم درۆیە چەند گەورەیە بەلایانەوە)، ئەنجا پیاوە ناودارەکانیان ووتیان: باشە ئەتوانی تۆ باسی شێوەی مزگەوتەکەمان بۆ بکەیت؟ چونکە هەندێك لە کافرەکان کە لەوی بوون سەفەریان کردبوو بۆ ئەو ووڵاتە و مزگەوتەکەیان واتە: (بیت المقدس) یان بەرچاوکەوتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((فذهبت انعت لهم، فمازلت انعت حتى التبس علي بعض النعت..)) واتە: ئنجا کەوتمە وەصف کردنی مزگەوتەکە بۆیان، بەردەوام بووم ئەوندەم وەصف کرد هەتا هەندێ وەصفم لێ تێك چوو، خوای گەورە مزگەوتەکەی وەك شێوەی خۆی هێنایە بەردەمم تا لەبەری خانووەکەی عەقیلەوە لە پێش چاوم بوو و سەیرم دەکرد و وەصفم دەکرد بۆیان، پاشان ئەوان ووتیان: بەڕاستی وەصف کردنەکەی تەواو بوو پێکای ...)[٣٣٤] .

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) بە موشریکەکانی فەرموو: ( نیشانەی ڕاستی ووتەکانم ئەوەیە من تێپەریم بەلای کاروانێکی ئێوەدا لە فلان جێگە و ووشترێکیان لێ ون بوو بوو، وە فلانە کەس گرتبوویەوە بۆیان،وە ئەوان ئێستا لە ڕێ ڕۆیشتنەکەیاندا گەیشتۆتە فلان جێگە، و لە فلان جێگە لایان داوە و لە ڕۆژی ئەوندە و ئەوندەدا دەگەڕێنەوە ووشترێکی سپی کە کۆپانێکی ڕەشی بەسەرپشتەوەیە لەگەڵ دوو مەشکەی ڕەش دا لە پێش کاروانەکەوە دەگەڕێتەوە لاتان بۆ ناو شاری مەککە لە فلان ڕۆژ و فلان ڕۆژدا، (شەدادی کوڕی ئەوس) دەفەرموێت: کاتێ ئەو ڕۆژە هات کە پێغەمبەر (ﷺ) دیاری کردبوو بۆ گەڕانەوەی قافڵەکە خەڵکان لەسەر بان و شوێنەگشتیەکان تەماشایان دەکرد تا نزیکی

---

(٣٣٤) اخرجه: أحمد (٣٠٩/١) (٢٨١٩) وقال محققة الارناؤوط : اسنادة صحيح على شرط الشيخين ، واخرجه ايضا برقم (٢٨٢٠) وقال الشيخ احمد شاكر: اسنادة صحيح ، والبزار (٥٦)، وابن ابي شيبة (٤٦١/١١)، و الطبراني في (الكبير) (١٢٧٨٢) ، والبيهقي في (الدلائل)(٣٦٤/٢) وقال محققة: رواة احمد و ابو نعيم بسند صحيح ، وقال الهيثمي (المجمع) (٦٥/١) : ورجال احمد رجال الصحيح ، وقال السيوطي في (الدر المنثور) (١٥٥/٤) : اسنادة صحيح ، وقال الشيخ مقبل بن هادي الوادعي رحمة الله في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين )(٦٨٨) : حديث صحيح على شرط الشيخين .

نیوەڕۆ بوو کاروانەکە لە دوورەوە دیار بوو کە گەڕایەوە یەکەم وشتریش لە پێشیانەوە ئەو ووشترە بووکە پێغەمبەر (ﷺ) وەصفی دا بوو) ئالێرەدا وەك تاقی کردنەوەیەکی خوایی بۆ موسوڵمانەکان وە لە ناویاندا هاوەڵی بەڕێز ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کە یەکەم کەس بوو پێغەمبەری(ﷺ) بەڕاست خستەوە، بەلام بە بیستنی ئەم هەواڵە هەندێ لە موسوڵمانە باوەڕ لاوازەکان پاشگەز بوونەوە لە ئاینی ئیسلام ) .[٣٣٥]

عائشە (رضی الله عنها) دەفەرموێت: (شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مزگەوتی ئەقصا کە بەیانی بوەوە بۆ خەڵکانی گێڕایەوە کەچی هەندێ لەوانەی کە باوەڕیان بە پێغەمبەر (ﷺ) هێنا بوو وە بەڕاستیان زانیبوو، پاشگەز بوەنەوە و کافر بوون و چوون بۆلای ئەبوبەکر و پێیان ووت: نابینی هاوەڵەکەت وا ڕادەگەیەنێت کە ئەمشەو شەوڕەوی پێ‌کراوە بۆ (بیت المقدس)، ئەبوبەکر فەرمووی: وای فەرمووە؟ ووتیان: بەڵێ، ووتی: ئەگەر وای فەرموبێت ڕاست دەکات، ووتیان:چۆن تۆ بەڕاستی دەخەیتەوە کە بەیەك شەو چوبێتە ئەوێ و گەڕابێتەوە پێش ئەوەی بەیانی بەسەردا هاتبێت؟ ووتی: من لەوە دوورتریش بەڕاستی دەخەمەوە کە هەواڵی ئاسمانی بۆ دێت لەبەرەبەیانێکدا یان لە ئێوارەیەکدا، دەفەرموێت: هەر لەو ڕۆژەوە ئەبوبەکر نازناوی (الصدیق) ی لێنرا)[٣٣٦] .

لەگەڵ ئەو هەموو وەصفەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردی سەبارەت بە مزگەوتەکەی ئەقصا و وەصف کردنی کاروانەکەیان کە هەموو ئەوانە نیشانەی ڕاستگۆیی پێغەمبەر (ﷺ) دەردەخەن کە نێرراوە لەلایەن خوای گەورەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە تاقی کردنەوەیەکی سەخت بوو بۆ هەندێ لە باوەڕ لاوازەکان و کەم هۆشە موسوڵمانە سەرەتاییەکان کە تازە موسوڵمان بوو بوون ، وە هیچ تێنەگەیشتبوون لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) .

ئیبن عەباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ( شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ (بیت المقدس) و کاروانەکەی بۆ ڕوون کردنەوە، بەلام هەندێ لە خەڵکان ووتیان: هەرگیزا ئێمە محمد

---

[٣٣٥] اخرجه: الطبراني في (الكبير) (١٧١٤٢) ، والبيهقي في (الدلائل ) (٣٥٥/٢) وقال : اسناده صحيح.

[٣٣٦] اخرجه: الحاكم (٦٢/٣) و صححه و وافقه الذهبي، والبيهقي في (الدلائل) (٢/ ٣٦٠-٣٦١)، والنسائي في (الكبرى ) (١١٢٨٣)، (الأجري الشريعة) ( ١٠٣٠) وقال محققه : اخرجه: الحاكم و البيهقي باسناد صحيح) وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة ) ( ٣٠٦).

بەڕاست نازانین لەم ووتانەدا و پاشگەز بوونەوە و کافر بوون و خوا لە گەردنی دان لەگەڵ ئەبو جەهلدا) [٣٣٧] .

# ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# لە شەوڕەو یەکەیدا بینی

**یەکەم: خوای گەورەی بینی بە دڵ:**

ئیبن عباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ( قد رأى النبي (ﷺ) ربه )[٣٣٨] واتە پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورەی بینی بەڵام ڕاجیح وایە کە بەدڵ بووە وەکو ئیبن و عەباس دیسان دەفەرموێت: ( رآه بقلبه )[٣٣٩]واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لەو شەوەدا خوای خۆی بینی بە دڵ، وە ئەبو ذەریش(رضي الله عنه) دەفەرموێت: (رآى النبي (ﷺ) ربه تبارك و تعالى بقلبه و لم يره ببصره )[٣٤٠] واتە: پێغەمبەر (ﷺ) خوای خۆی بینی بەدڵی نەك بە چاوی، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) خوای خۆی بینیوە لە خەودا لە جوانترین شێوەدا:

(معاذی کوڕی جبل)(رضي الله عنه) دەفەرموێت: (بەیانیەکیان پێغەمبەر (ﷺ) دواکەوت و نەهات پێش نوێژیمان بۆ بکات تا زۆر دوا کەوتین و وەخت بوو ڕۆژ هەڵبێت ، پاشان بەپەلە هات، و قامەت کرا و پێش نوێژی بۆ کردین و بەپەلە نوێژەکەی بۆ تەواو کردین، کە سەلاممان دایەوە هەستا و فەرمووی: (على مصافكم كما انتم) واتە: لە جێگای خۆتان بمێننەوە تا بۆتان بگێڕمەوە ئنجا فەرمووی: ((اما اني ساحدثكم ما حبسني عنكم الغداة، اني قمت من

---

[٣٣٧] اخرجه: أحمد (١/٣٧٤) (٣٥٤٦) و قال الشيخ احمد شاكر و شعيب الأرناؤوط : اسناده حسن صحيح، وابو يعلى (٢٧٢٠)، والنسائي في (التفسير ) (٣٠٣) و قال محققه : اسناده حسن صحيح، والطبري في (تهذيب الآثار ) (١٧) ، واللالكائي (١٤٣٠)، وقال الحافظ ابن كثير في (تفسير القرآن العظيم)(١/١٥٠) : اسناده صحيح، وقال الشيخ الألباني في (فقه السيرة )(١٤٦) : اسناده حسن.

[٣٣٨] اخرجه: الترمذي (٣٢٧٨)، والطبراني في (الكبير) (١٠٧٢٨) ، والحاكم (٢/٤٦٩) ، وابن حبان (٥٧)، وقال محققه: اسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي ) ( ٢٦١٤).

[٣٣٩] اخرجه: مسلم (٤٣٥) ، والترمذي ( ٣٢٧٩) ،وصححه الشيخ اللألباني في (صحيح الترمذي)( ٢٦١٥).

[٣٤٠] اخرجه: النسائي في (التفسير)(٥٥٦) و قال محققه : صحيح.

الليل فتوضأت فصليت ما قدر لي فنعست في صلاتي فاستثقلت فاذا أنا بربي تبارك و تعالي في احسن صورة و في رواية (رايت ربي عزوجل) فقال: يا محمد، قلت: رب لبيك، قال: فيم يختصم الملاء الأعلى ..))[٣٤٠] واتە: ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە چی وای لێکردم کە دوا بکەوم، ئەمشەو من شەونوێژم کرد ئەوەندەی لە توانامدا بوو تا وەنەوز بردمیەوە و خەوم لێکەوت و پەروەردگارم بینی (تبارك و تعالى) لە جوانترین شێوەدا) وە ( فەرموی: ئەی محمد، ووتم: پەروەردگارم (لبيك)، فەرمووی: کۆمەڵە هەرە سەروو (الملأ الأعلى) لە چیدا دەمەقاڵیان دەبێت ....) .

**دووەم: چەند کۆمەڵێکی بینی کە لێو و زمانیان لێ دەکرایەوە:**

ئەنەس (ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( رأيت ليلة أسري بي رجالاً تقرض شفاهم بمقاريض من نار، فقلت: من هؤلاء ياجبريل؟ فقال: الخطباء من أمتك يأمرون الناس بالبر و ينسون أنفسهم و هم يتلون الكتاب أفلا يعقلون )[٣٤٢] واتە: لەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا تێپەڕیم بەلای پیاوانێکدا بینیم لێویان بە مقەستی ئاگرین پارچە گۆشتی لێ ئەکرایەوە، ووتم: ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ فەرمووی: ئەمانە ووتار بێژەکانی ئومەتی تۆن

---

[٣٤١] اخرجه: أحمد (٣٦٨/١) (٢٤٢/٥)، والترمذي (٣٢٣٥)، وقال حسن صحيح و سألت محمد بن اسماعيل فقال : صحيح، والدارمي(٢٠٧٣) ، والحاكم (٥٢١/١) ، والطبراني في (الكبير) (٩١/٢٠)،وابن ابي عاصم في (السنة ) (٤٦٩)، وابو يعلى (٢٦٠٨)، وابن خزيمة (٣١٩)، وعبد بن حميد (٦٨٢) ، وقال ابن كثير في (التفسير) (٢٢/٦) رواه احمد على شرط الصحيح، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي ) (٢٥٨٠، ٢٥٨١، ٢٥٨٢) ، (صحيح الجامع) ( ٣٤٦٦ ، ٥٩)، (صحيح الترغيب) (٤٠٥)، (الإرواء) (٦٨٤)، وقال الشيخان عبدالقادر الأرناؤوط و شعيب الأرناؤوط في تحقيقهما لـ(زاد المعاد)(٣٧/٣): حديث صحيح.

[٣٤٢] اخرجه: أحمد (١٢٢١١) وقال محققه: حديث صحيح ابن ابي شيبة (٣٠٨/١٤)، وابو نعيم في الحلية (١٧٢/٨) ، وابو يعلى ( ٣٩٩٢ ، ٤٠٦٩ ، ٤١٦٠)، والبزار (٣٣٢١،٣٣٢٢)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (١٧٧٣، ٤٩٦٥،٤٩٦٦)، وابن حبان(٥٣)، وقال محققه : حديث صحيح بمتابعاته، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة ) (٢٩١)، (صحيح الجامع )(١٢٩)،(صحيح الترغيب) (١٢١)، وصححه الشيخ مقبل بن هادي الوادعي في (الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين (٨٤).

فەرمان بە خەڵکی دەکەن کە چاکە بکەن بەڵام خۆیان لە بیر دەکەن و ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە و ئەقڵیان پێ ناشکێت ...

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ( بینیم زمانیان پارچە پارچە گۆشتی لێ دەکرایەوە)[٣٤٣] ، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (أتيت على السماء الدنيا ليلة أسري بي فرأيت فيها رجال تقطع ألسنتهم و شفاهم بمقاريض من نار فقلت: يا جبريل ما هؤلاء؟ قال: خطباء أمتك ...)[٣٤٤] واتە: لەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا گەیشتینە ئاسمانی دونیا بینیم پیاوانێك زمان و لێویان دەبڕرا بە چەند مقەستێکی ئاگرین، ووتم: ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ ووتی: ئەوانە وتاربێژەکانی ئومەتی تۆن .

**سێهەم: هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) سزای غەیبەت کارانی ئومەتەکەی خۆی بینی کە چۆن سزا دەدرێن لە بەرزەخدا:**

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

( لما عرج بي مررت بقوم لهم أظفار من نحاس يخمشون وجوههم و صدورهم،فقلت من هؤلاء يا جبريل؟ قال: هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناس و يقعون في أعراضهم )[٣٤٥]واتە: کاتێ بەرز کرامەوە تێپەڕیم بەلای کەسانێکدا کە نینۆکی مسیان هەبوو دەم و چاو و سنگی خۆیانیان پێ دەڕنیەوە (واتە: خەڵتانی خوێنیان دەکرد) ووتم ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ ووتی: ئەوانە کەسانێکن گۆشتی خەڵکان دەخۆن و ناموسیان لەکەدار دەکەن .

---

(٣٤٣) اخرجه: ابو يعلى /٤٠٦٩ ,وقال محقق مجمع الزوائد(١٢١٨١) : إسناده صحيح.

(٣٤٤) اخرجه: ابو يعلى (٤١٦٠) ، والبيهقي في (الشعب الإيمان) (٤٩٦٥) ، وصححه الشيخ مقبل بن هادي الوادعي في (الصحيح المسند ..) ( ٨٤).

(٣٤٥) اخرجه: احمد (٢٢٤/٣) ، وابى داود (٤٨٧٨)، والبيهقي (٦٧١٦) ، وقال الحافظ العراقي في (الإحياء) (٨٣٩/٣) : صحيح،وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة ) (٥٣٢) ، (صحيح ابي داود ) (٤٠٨٢) ، (فقه السيرة ) (١٤٤)، وصحح إسناده الشيخ الأرناؤوط في (رياض الصالحين ) (٥٧٤)،والشيخ مقبل في (الصحيح المسند )(١٣١).

**چوارەم: پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەو شەوەدا تێپەری بەلای بۆنێکی خۆشدا کە بۆنی قژ داهێنەرەکەی کچی فیرعەون بوو:-**

لە ئیبن عەباسەوە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: ( پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ئەو شەوەی شەوڕەویم پێکرا تیایدا بۆنێکی خۆش بەڕووم دا هات و ووتم: ئەی جبریل ئەو بۆنە خۆشە چی یە؟ ووتی:ئەوە بۆنی قژ داهێنەرەکەی کچەکەی فیرعەونە و منداڵەکانیەتی، ووتم: چۆن بوو حاڵیان؟ ووتی: ڕۆژێکیان قژی کچەکەی فیرعەونی دادەهێنا شانەکەی لەدەستکەوتە خوارەوە ووتی: (بسم الله) کچەکەی فیرعەون ووتی: مەبەستت لە باوکمە؟ ووتی: نەخێر پەروەردگاری من و باوکت (الله) یە ، ووتی: بۆی دەگێڕمەوە؟ ووتی: بۆی بگێڕەرەوە، ئەویش بۆی گێڕایەوە و فیرعەون بانگی کرد و ووتی: فلانە ئافرەت هیچ خوایەکی ترت هەیە جگە لە من؟ ووتی: بەڵێ: پەروەردگاری من و تۆ (الله) یە، فیرعەون فەرمانی دا یەك مەنجەڵی گەورە پڕبکەن لە مس و بیکوڵێنن کە ئامادە بوو منداڵەکانی ئافرەتەکەی بانگ کرد بۆ ئەوەی دانە دانە بیانخاتە ناویەوە ، ئافرەتەکە ، ووتی: من تەنها داواکاریەکم هەیە لە تۆ؟ فیرعەون ووتی:چی یە ؟

ووتی: ئەوەیە کە دوای مردنمان ئیسك و پروسکی خۆم و منداڵەکانم بکەیتە یەك بەرگ و بمانکەیتە ژێر خۆڵ بەیەکەوە؟ ووتی:باشە داواکاریەکەت لەسەر من، پاشان دانە دانە منداڵەکانی لە پێش چاوی خۆی فڕێ دەدایە ئەو مەنجەڵە گەورەیەی کە مسی تیا بوو، تا سەرە گەیشتە خۆی و منداڵێکی شیرە خۆرەی ئەنجا دوو دڵی ڕووی تێکرد ، کە خۆی فڕێدات یان نا لەبەر منداڵەکەی تا خوای گەورە منداڵەکەی هێنایە زمان و بەدایکی ووت: خۆ ڕاگر بە تۆ لەسەرحەقیت خۆت بخەرە ناوی سزای دونیا سوکترە لە سزای قیامەت ئەنجا خۆی و منداڵەکەی فڕێدایە ناوی....) [٣٤٦].

---

[٣٤٦] اخرجه: أحمد (١/١٣٠) (٢٨٢٤،٢٨٢١) و قال محققه الأرناؤوط : إسناده حسن،والطبراني في (الكبير)(١٢٢٨٠)،والبزار (٥٤)كشف،وابو يعلى (٢٥١٧)،والحاكم (٢/٤٦٩) ،و صححه و وافقه الذهبي،وابن حبان (٢٩٠٤)، وقال محققه: إسناده قوي،وقال الحافظ ابن كثير في (التفسير)(٣/٤٨٠) : إسناده لابأس به،وقال الذهبي في (سير إعلام النبلاء)(١/١٨٤): حديث حسن،وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع الصغير)( ٤٧٧٢)،(السلسلة الضعيفة )(٨٨٠)، فاوردته للأعتبار و العلم فقط.

**پێنجەم: پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەو شەوەدا بەلای گۆڕەکەی پێغەمبەرموسا(عليه السلام) دا تێپەڕی کە لای تەپۆڵکە سوورەکەی ئەوبەری شاری (بيت المقدس) بوو بینی لە گۆڕەکەیدا بە پێوە نوێژی دەکرد:**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ( مررت بموسى ليلة أسري بي عند الكثيب الأحمر وهو قائم يصلي في قبره .... ) [٣٤٧] واتە: لەو شەوەی کە شەو ڕەویم پێکرا ڕۆیشتم بەلای موسادا(عليه السلام) لە نزيك تەپۆڵکە سوورەکە و موسا (عليه السلام) بە پێوە لە گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد.

**شەشەم: هەر لەو شەوەدا فریشتەکان پێغەمبەریان (ﷺ) ئاگادارکردەوە کە (کەڵە شاخ) بەکاربهێنێت:**

لە ئیبن عەباسەوە (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ( ما مررت ليلة أسري بي بملأ من الملائكة إلا كلهم يقول: عليك يا محمد بالحجامة ... ) [٣٤٨] واتە: لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێ کرا بەلای هەر پۆلێ لە پۆلەکانی فریشتە دادەڕۆیشتم پێیان دەووتم : ئەی محمد کەڵە شاخ بگرە، وە لەڕیوایەتیکی ی تردا ( ما مررت ليلة أسري بي بملأ إلا قالوا: يا محمد مُر أمتك بالحجامة ) [٣٤٩].

واتە: لەو شەوەی کە شەوڕەو یم پێ کرا ، بەلای هەر کۆمەڵێ لە کۆمەڵەکانی فریشتە دادەڕۆیشتم پێیان دەووتم: ئەی محمد فەرمان بکە بە ئومەتەکەت کەڵە شاخ بگرن و بەکاری بهێنن .

**حەوتەم: هەر لەو شەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵایەکی گەورەی بەرچاوکەوت کە بەرزکرایەوە و لە شام داکوترا :** لە عبداللە کوڕی حەوالەوە (رضي الله عنه)دەگێڕنەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (رأيت ليلة أسري بي عمودا أبيض كأنه لؤلؤة تحمله الملائكة قلت: ما تحملون؟ فقالوا: عمود

---

[٣٤٧] اخرجه: مسلم ( ٦١٠٧ ، ٦١٠٨)، والنسائي (٣/ ٢٤) ، واحمد (٣/ ١٤٨) ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي ) ( ٣/ ٢١٥) ، (السلسلة الصحيحة ) (٢٦٢٧).

[٣٤٨] اخرجه: احمد (١/ ٣٥٤) ، وابن أبي شيبة (٧/ ٤٤٢)، والترمذي ( ٢٠٥٣)، وابن ماجة (٣٤٤٧)، والطيالسي (٢٦٦٦)، والحاكم (٤/ ٢٠٩ )، وصححه ، وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٢٦٣) و (صحيح ابن ماجة ) ( ٢٨٠١) و (المشكاة ) ( ٤٥٤٤).

[٣٤٩] اخرجه: ابن ماجة ( ٣٤٧٧)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة ) ( ٢٨٠٢)، و (صحيح الجامع) (٥٦٧١).

الكتاب أمرنا أن نضعه بالشام...) [٣٥٠].واتە: لەو شەوەدا كە شەوڕەویم پێ كرا كۆڵەكەیەكی سپیم بینی وەك مرواری فریشتە هەڵیان گرتبوو ووتم: ئەوە چی یە؟ ووتیان:ئەوە عەموودی كتێبە فەرمانمان پێ كراوە لە شام دایبنێین و جێگیری بكەین.

لە ڕیوایەتێكی تردا: (و بینما انا نائم) إذا رأیت عمود الكتاب أحتمل من تحت رأسي فظننت أنه مذهوب به فأتبعته بصري فعمد به الى الشام الا وأن الإیمان حین تقع الفتن بالشام) [٣٥١]. واتە: لەو شەوەدا كۆڵەكەی كتێبم بینی وەك ئاڵایەك هەڵگیرا لە ژێر سەری منەوە، و وام زانی لەسەر زەوی ناهێڵرێت و دەبرێتە سەر، چاوم بە دوایدا دەڕوانی هەتا بینیم بردیان بەرەو شام، ئاگاداربن كاتێ كە فیتنە هەستێ تەنها باوەڕ (ئیمان) لە شام دەبێت .

ئیبن كثیر دەفەرموێت: (هەر ئەو بەیانی یە كە پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە لە شەوڕەو یەكەیدا جبریل دابەزی بۆلای لە كاتی نزیك نیوەڕۆدا وكاتەكانی نوێژی بۆ ڕوون كردەوە و لەكەیدا دەكرێت، وچۆن ئەنجام دەدرێت پاشان فەرمانی كرد بە پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵانی خۆی كۆبكاتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) كۆی كردنەوە و جبریل (عليه السلام) پێش نوێژی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) كرد و ئەویش پێش نوێژی بۆ هاوەڵانی دەكرد ) [٣٥٢]، لە ڕیوایەتێكی تردا: ( أمّني جبريل (عليه السلام) مرتين (بمكة) عند البيت ....) [٣٥٣].

واتە: جبریل سەلامی خوای لەسەر بێت دووجار پێش نوێژی بۆ كردم لە مەككە لای كەعبە .

---

[٣٥٠] اخرجه: الطبراني في (الكبير) ، وقال الهيثمي في (المجمع ) (١٦٦٤٤) :رواه الطبراني و رجاله رجال الصحيح غير (صالح بن رستم) و هو ثقة، وقال الحافظ في (فتح الباريء ) ( ٢/ ٤٩٨) : إسناده صحيح.

[٣٥١] اخرجه: أحمد ( ٥/ ١٩٨) (٢١٧٣٣) وقال محققه : اسناده صحيح ، والطبراني (الشامين) (١١٩٨) ، وابن عساكر (٤٩/١) ، والبزار (٣٣٣٢) والبيهقى (الدلائل) (٤٤٤٧/٦) ، وأبو نعيم (الحلية) (٩٨/٦) ، قال الهيثمي في (المجمع) ( ١٦٦٤٠) : رواه لحمد و الطبراني و رجال احمد رجال الصحيح ، وقال الشيخ مقبل بن هادي الوادعي في (الصحيح المسند) ( ١٠٥٦) : حديث صحيح.

[٣٥٢] انـــظر: (البداية ) ( ١١٧/٣) .

[٣٥٣] اخرجه: الدار قطني ( ١/ ٢٥٨) ، برقم (١٠٠١، ١٠٠٣) و قال محققه : اسناده حسن،و اخرجه: احمد (٣٣٣/١ )، و ابوداود (٣٩٣)، والترمذي (١٤٩) ، والحاكم (١٩٣/١ – ١٩٦) ، و البيهقي الكبرى (٣٦٨/١).

هەر لەو کاتەوە خوای گەورە پێغەمبەری(ﷺ) فێری نوێژ و دەست نوێژ و کاتەکانی نوێژ کردووەبۆیە دەفەرموێت: ( صلوا كما رأيتموني أصلي )[٣٥٤]واتە: نوێژ بکەن وەك چۆن دەبینن من نوێژ دەکەم .

## خۆ ناساندن بە هۆزەکانی عەرەب و داوای پەنادان

دوای دژایەتی توندی چەندین ساڵە دژ بە پێغەمبەر (ﷺ) لەلایان قورەیش و هاوپەیمانەکانیەوە، دوای ئەو هەموو نارەحەتی یەی هاتە رێی پێغەمبەر (ﷺ)هاوەڵەکانی تا زۆربەیان ناچار کران کە وولاتیان بەجێ بهێڵن بۆ دەرەوە و بەرەو حەبەشە بکەونە رێ، لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) کۆڵنەدەرانە و بێ ترس و ورە بەرزانە ئاینی خوای بەرقەرار دەکرد و بە ئاشکرا دەیگەیاند بەتایبەتی لەو کاتەدا کە نوێنەری هۆزەکانی عەرەب هاتبوون بۆ حەج کردن بۆ کەعبە.

(جابر)(ﷺ) دەفەرموێت: ( كان رسول الله (ﷺ) يعرض نفسه على الناس في الموسم، فيقول: ألا رجل يحملني الى قومه فإن قريشاً قد منعوني أن أبلغ كلام ربّي )[٣٥٥] . واتە: پێغەمبەر (ﷺ) خۆی نیشانی هۆزەکانی عەرەب دەدا لە کاتی حەج کردن و پێی دەوتن: ئایا کەسێك یە من ببات بۆ لای خزمان و کەسانی خۆی چونکە قورەیش رێگریان کردووم لە گەیاندنی ووتەکانی خوا بە خەڵکی .

سەبارەت بە چۆنیەتی گەیاندنی بانگەوازی خوا لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆ سەرجەم هۆزەکانی ئامادە بووی عەرەب لە مەککە وە چۆنیەتی هەڵوێستیان وە هەڵوەێستی قریش بە تایبەت مامەی خۆی ئەبولەهەب ئەم ریوایەتەی خوارەوە ئەمەمان بۆ روون دەکاتەوە:-

---

[٣٥٤] اخرجه: البخاري ( ٦٣١).

[٣٥٥]اخرجه: البخاري في (خلق أفعال العباد ) ( ٤١)، وابو داود ( ٤٧٣٤) ، والترمذي ( ٢٩٢٥)، وابن ماجة ( ٢٠١) ، والحاكم (٦١١/٢ )، و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، والبيهقي في (الشعب) ( ١٦٨)، وصححه الذهبي على شرط البخاري ، أنظر (سير إعلام النبلاء )( ١٩٢/١) ،وصححه الشيخ الألباني في ( صحيح أبي داود )( ٣٩٦٠) ، (صحيح الترمذي )( ٢٣٣٤٥) ، (صحيح ابن ماجة ) (١٦٦) ، ( السلسلة الصحيحة ) ( ١٩٤٧) ، وصححه الشيخ مقبل على شرط البخاري في ( الصحيح المسند ) ( ٢٢٤).

(طاریقی کوڕی عبدالله ی محاریبی)(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) گەڕاوە بەسەر هۆزەکاندا و چۆن بانگەوازی کردووە و چی بە گوێ ی ئەواندا داوە دەفەرموێت: ( پێغەمبەرم (ﷺ) بینی لە بازاڕی (ذی المجاز) جلێکی خەت خەتی سووری لەبەردا بوو بە ناو ڕیزی خەڵکاندا دەهات و دەچوو و دەیفەرموو:

ئەی خەڵکینە بڵێن (لاإله إلا الله) سەرفراز دەبن، ئەی خەڵکان خوای گەورە فەرمانتان پی دەکات کە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن ، دەفەرموێت: بە ناو شوێنی ئەو بازاڕەدا دەگەڕا و خەڵکانیش لێ ی کۆدەبوونەوە و کەسم نەبینی وەڵامی پێغەمبەر (ﷺ) بداتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) بێدەنگ نەدەبوو هەر دەی فەرموو: بڵێن (لاإله إلاالله) سەرفراز دەبن، بەڵام پیاوێکی پێست سپی خێلی دووپەلکەدار بە دوای کەوتبوو بەهەر شوێنێکدا دەڕۆی، بەردی تێدەگرت و هەردوو پاژنەی قاچی برینداروخوێناوی کردبوو، لەدواوە هاواری لێ دەکرد و دەیووت: ئەی خەڵکان بەگوێی نەکەن ئەوە درۆزنە، ئەوە گومڕا بووە و لە ئاینی خۆتان و باب و باپیرانتان گومڕاتان دەکات ، پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی لێ دوور دەخستەوە، ئێمەش بە دوایدا دەڕۆیشتین و ڕامان دەکرد، ووتم: ئەمە کێیە شوێنی کەوتووە و وازی لێ ناهێنێت و بەردی تێ دەگرێت؟

ووتیان: ئەوە مامەکەیەتی (عبدالعزی / ئەبولەهەب)......) [٣٥٦]. لە ڕیوایەتێکی تردا: پیاوێکی (بەنی کینانە) دەفەرموێت : ( پێغەمبەرم (ﷺ) بینی لە ناو خەڵکاندا دەهات ودەچوو لە بازاڕی ( ذی مجاز) دەی ووت: (( یا أیها الناس قولوا (لاإله إلاالله) تفلحوا )) ئەبو جەهلیش شوێنی کەوتبوو وە خۆڵی دەپڕژاند و دەیووت : (ئەی خەڵکان ئەمە هەڵتان

---

[٣٥٦] اخرجه: أحمد (٤٩٢/٣) (١٦٠٢٠) و قال محققه الأرناؤوط : إسناده صحيح ، ( ١٦٠٢٣) ، وقال محققه: إسناده حسن ، وأحمد( ٣٤١/٤)، وصحح إسناده الأرناؤوط في (زاد المعاد ) ( ٣/ ٣٩) ، والطبراني في (الكبير) ( ٤٥١٢ ، ٤٥٩٠) ،والنسائي ( ٥٥/٨)، وابن أبي شيبة ( ١٠٠/١٤)،وصحح إسناده البوصيري في (مختصر الإتحاف) ( ٤٧٨٨) ، وابن خزيمة (٨٢/١)، والحاكم (١٥/١ ، ٦١١/٢ – ٦١٢) و صححه و وافقه الذهبي، والبيهقي في (الكبرى ) ( ٣٨٠/٥)، وابن حبان ( ٦٥٦٢)، وقال محققه : اسناده صحيح،وصححه الشيخ الألباني في (دفاع عن الحديث و السيرة ) ( ٢٢) ، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند )(٥١٦).

نەخەڵەتێنێ دەست بگرن بە ئاینی خۆتانەوە ، ئەمە دەیەوێت دوورتان خاتەوە لە خواکانتان و لە (لات و عوزا) ، پێغەمبەر یش (ﷺ) ئاوڕی لێ نەدەدایەوە[٣٥٧] .

وە لەو هۆزانەی تر کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی پێناساندوون و داوای سەرخستنی لێ کردون بۆ ئاینی خوا، هۆزی کیندە بوو، (ئەبو شیهابی زوهری) (ﷺ)دەفەرموێت: ( پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای نوێنەرانی هۆزی کیندە لە جێگەی دانیشتنی خۆیاندا و لای دایە لای گەورەکەیان کە ناوی (ملیح) بوو، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کرد بۆلای خوای گەورە، و خۆی پێناساندن و داوای لێ کردن کە بیگرنە خۆ بەڵام وەڵامیان نەدایەوە و نەیان گرتە خۆ ...) [٣٥٨] .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) داوای پەنادانی لە (کوڕانی بەنی شەیبان) کرد: لە (علی کوڕی ئەبی طالیبەوە) (ﷺ) دەفەرموێت: ( کاتێ خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە ئاینی خوا بگەیەنێت بە هۆزەکانی عەرەب ئێمە چووین و ئەبوبەکریشمان لەگەڵ دابوو، تا گەیشتینە لای مینا کە جێگەیەکە لە ڕێ ی عەرەفات، چووینە لای کۆمەڵێ دانیشتووی ئەوێ و چووینە پێشەوە لێیان، ئەبوبەکر سەلامی لێ کردن چونکە ئەو شارەزاتر بوو بەسەرجەم هۆزەکانی عەرەب، دوای ئەو کۆمەڵە چووینە لای کۆمەڵێکی تر ڕێز و هێمنی و ئارمییان پێوە دیار بوو، هەندێ لە پیاوە بەرزەکانیان دانیشتبوون ڕێزو سەروەریان پێوە دیاربوو، ئەبوبەکریش پێش کەوت و سڵاوی کرد و دوای ئەوە پێی ووتن: ئێوە کێن؟ ووتیان: ئێمە کوڕانی بەنی شەیبانی کوڕی سەعلەبەین، ئەبوبەکر ئاوڕی دایەوە بەلای پێغەمبەردا (ﷺ) و ووتی:

دایك و باوکم فیدات بێ لەمانە بەهێزتر و سەربەرز تر نین لە کەسانی خۆیان، لەو ڕۆژدا ئەم سەرکردانەیان ئامادە بوون : مەفروقی کوڕی عومەر و هانیئی کوڕی قوبەیضە و موسەنای کوڕی حاریسە و نوعمانی کوڕی شورەیك، وە نزیکترین کەسیان لای ئەبوبەکرەوە لە کۆبونەوەکەدا مەفروق بوو کە بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: لەوە دەچێ تۆ برا قورەیشیەکە بیت؟ ئەبوبەکریش ووتی:ئەگەر پێتان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوایە بەڵێ

---

[٣٥٧] أخرجه : أحمد (١٦٦٠٣) وقال محققه : اسناده صحيح، وقال الهيثمي في ( المجمع) (٦/٢١) : رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح .

[٣٥٨] انـــظر :سيرة ابن هشام (٢/٣٤) و قال محققاه : مرسل صحيح،والطبري في (التأريخ ) (٢/٣٤٩).

ئەوە، مەفروق ووتی: پێمان نەگەیشتووە کە ئەو وا دەڵێت پاشان ئاوڕی دایەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی ووت: بانگەواز بۆلای چی دەکەیت ئەی برای قوڕەیشی؟ پێغەمبەریش (ﷺ) چوو لەلایان دانیشت و ئەبوبەکر هەستا و چوو لە پشتەوە سێبەری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کرد.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: بانگتان دەکەم بۆ ئەوەی شایەتی بدەن کە هیچ خوایەك نی یە شایانی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، وە داواتان لێدەکەم کە بمگرنە خۆ و پارێزگاریم لێ بکەن و سەرم بخەن تا ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم بیگەیەنم چونکە قوڕەیش دژ بە فەرمانی خوا وەستاون و پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) بە درۆ خستۆتەوە و وازیان لە حەق هیناوە، خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندە و سوپاس گوزارە.

پاشان مەفروق ووتی: باشە دوای ئەوە چی تر داوا دەکەیت و بانگەواز بۆ چیتر دەکەیت ئەی برا قوڕەیشی یەکە؟ پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی بۆ خوێندنەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾﴾ (الأنعام: ١٥١)

دوای ئەو مەفروق ووتی: بۆچی تر بانگمان دەکەیت؟ وەڵاهی ئەم قسانەی تۆ لە قسەی کەسانی سەرزەوی ناچێت، ئەگەر قسەی کەسانی سەر زەوی بوایە دەمانناسی یەوە؟ پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە کە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ (النحل: ٩٠) کە مەفروق گوێی لەمە بوو ووتی: وەڵاهی برا قوڕەیشی یەکە بانگەشەت کردووە بۆلای هەرە خوڕەوشتی جوان و کاری هەرە چاك، بەڕاستی بوختانچین ئەو کەسانەی کە تۆیان بەدرۆ خستۆتەوە و دژت وەستاون بەڵام ئەوەش: هانیئی کوڕی قوبەیضە یە گەورەمانە و خاوەنی ئاینی ئێمەیە، هانیئ بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: گوێم لە قسەکانت بوو ئەی برا قوڕەیشی یەکە، قسەکانت بەڕاست دەزانم، من وا دەزانم وازهێنانمان لە ئاینمان و شوێن کەوتنمان بۆ تۆ لە سەر یەك دانیشتن

کەسەرەتا و کۆتایی نی یە بۆ ئەوەی ئێمە بیری لێ بکەینەوە بێگومان ئەمە هەڵەیە و بیروبۆچوونێکی جیاوازە و ئەقڵێکی لاوازە و هەڵەش تەنها لەگەڵ پەلەدا دەبێت بەلام ئێمە کەسان و خزمانێکمان هەن لە پشتمانن ناتوانین هیچ ووتەیەك بکەین بۆ ئەوان، تۆ بگەڕێرەوە و ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆلای خزمانمان و تۆ بیربکەرەوە و ئێمەش بیری لێ دەکەینەوە و دوایی (واتە: بۆ ئەوەی باسەکە لە خۆی دوور بکاتەوە) ووتی: ئەمەش (موسەنا) یە گەورەمانە و خاوەنی جەنگمانە.

موسەننا ووتی: گوێم لە قسەکانت بوو ئەی برا قوڕەیشی یەکە، قسەکانت بەڕاست دەزانم، وە سەرم سوڕ دەمێنێ لەو قسە چاکانەی تۆ، وەلامی منیش وەلامی هانئی کوڕی قوبەیضە یە، ئێمەش لامان داوەتە دوو قەراخ قەراخی یەمامە و قەراخی سەماوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەو دوو قەراخە چین؟ ووتی: قەراخیکیان لایەکی ووشکانی یە و لایەکەی تریان ڕووبارە و خاکەکانی کیسرایە کە گفتی لێ وەرگرتووین هیچ ئاژاوەیەك دروست نەکەین و هیچ ئاژاوەچی یەك نەگرینە خۆمان و ئەم کارەی تۆش پێ دەچێت کە پاشایان ڕقیان لێ ی بێت و دژی بوەستن، ئەگەر ڕووبە عەرەب و ووشکانی دەڵێیت ئێمە لە خزمەتاین و سەرت دەخەین هەر کەسێك هەر تاوانێك بکات لەوێ تاوانەکەی لێ دەبورین و عوزرەکەشی وەردەگیرێت بەلام هەر کەسێك تاوانێك لەڕووی کیسرا دا بکات (واتە: خاکەکانی کیسرا ) ئەوا لە تاوانەکەی نابورێت و عوزرەکەشی وەرناگرێت، ئەگەر پێت خۆشە سەرت بخەین لە ڕووی نزیك عەرەبەوە ئەوا سەرت دەخەین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خراپتان وەلام نەداوەتەوە کاتێ ڕاست گۆیانە قسەتان کرد بەلام یەکێ هەڵدەستێ بە ئاینی خوا و بەرقەرار کردنی کە لە هەموو لایەکەوە گرتبێتی و کردەوەی پێ کرد، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و بەجێی هێشتن )[٣٥٩].پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ناساندە بەنی حەنیفە بەلام خزمانی موسویلەمە بە ناشیرین ترین شێوە بەرپەرچی پێغەمبەر (ﷺ) یان دایەوە، وە خۆی ناساندە کوڕانی بەنی عامر ئەوانیش بەهەمان شێوە یان کرد .

---

[٣٥٩]اخرجه: الطبراني في (الكبير ) ( ٦٢/٦) مختصرا ، والبيهقي في (الدلائل ) (٤٢٢/٢) ،وابو نعيم في (الدلائل) ( ٢١٤) ، وقال الهيثمي في (المجمع) ( ٢١١/٦) : رجاله رجال الصحيح غير (خلاد) وهو ثقة، وقال الحافظ في ( الفتح ) ( ٢٢٠/٧): اخرجه: الحاكم و البيهقي في الدلائل و ابو نعيم بإسناد حسن.

لە (جابیرەوە)(ﷺ) دەفەرموێت: ( پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ناساند بەخەڵکان لە شوێنی وەستانیان لە حەج و پێ ی دەوتن: ئایا پیاوێك نیە بمگرێتە خۆ و بمبات بۆلای خزمانی خۆی چونکە قورەیش قەدەغەیان کردووە لەمن کە ووشەکانی خوای خۆم بگەیەنم، پیاوێك لە هۆزی (هەمدان) هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ئایا قەومەکەت ئەو هێزەیان هەیە کە بتوانن بمگرنە خۆ؟ ووتی: بەڵێ، دوایی پیاوەکە پەشیمان بووە و ترسا کە لەوەی بیگرێتە خۆ بەڵام هۆزەکەی نەیگرنە خۆ بۆیە بە پێغەمبەری(ﷺ) ووت: ئەچمەوە بۆلایان و قسەی تۆیان بۆ ئەگێڕمەوە و پاشان وەڵامەکەت بۆ دەهێنمەوە، ئەنجا ڕۆیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: باشە بڕۆ) [٣٦٠]. لە مانگی ڕەجەبی هەر ئەوساڵەدا وەفدی پایەبەرزانی ئەنصار بۆ یەکەم جار گەیشتنە ناو شاری مەککە:-

ئەم وەفدەش کۆمەڵێك بوون لە کوڕانی ئەوس کە ژمارەیان کەم بوو وە دژایەتی یەکی سەخت هەبوو لە نێوان ئەوان و خەزرەجی ژمارە زۆر و خزمانی بەنوقەینوقاع وبەنونضیر و بەنوقورەیضە، بەڵام هۆزی ئەوس هاوپەیمانیان نەبوو ئەوانیش بە ناچارانە ڕوویان کردە مەککە بۆ ئەوەی داوای پەیمان بەستن بکەن لەگەڵ قورەیش کە یاریدەدەری ئەوس بێت دژ بە خەزرەج بەڵام خوای گەورە لەو هاوپەیمانیتی یە چاکتری بە نسیب کردن ئەویش موسوڵمان بوونیان و ڕێنموییی بونیان بوو وە ناسینی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بوو، ئەم بەسەرهاتەش (محمدی کوڕی لەبەید)(ﷺ) دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

( کاتێ ئەبولحەسیر (ئەنەسی کوڕی ڕافع) گەیشتە مەککە لەگەڵ هەندێ لە کوڕانی بەنی عەبدولئەشهەل کە ئەیاسی کوڕی مەعاذیان تیا بوو بۆ ئەوەی پەیمان ببەستن لەگەڵ قورەیشدا دژ بە هۆزی خەزرەجی خۆیان، پێغەمبەر (ﷺ) پێی گەیشت کە ئەو کۆمەڵە لە

---

[٣٦٠] اخرجه: احمد ( ٣/ ٣٩٠)(١٥١٩٢) وقال محققه : اسناده الصحيح على شرط البخارى ، وابن أبي شيبة (١٤/٣١٠) ، والدرامي (٣٣٥٤) ، وأبو داود (٤٧٣٤) ، والترمذي (٢٩٢٥) ، وابن ماجة (٢٠١) ، والنسائي (الكبرى) (٧٧٢٧) ، والحاكم (٢/٦١٢) ، والبيهقي ( الشعب )( ١٦٨) ، و صححه الشيخ الألباني ( الصحيحة) (١٩٤٧)،و( صحيح ابن ماجة) (١٦٦) ،وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد ) ( ٦/٣٥): رواه احمد و رجاله رجال ثقات،وقال الشيخ مقبل في (الصحيح المسند ) ( ٢٦٤)حديث صحيح، وصحح إسناده العمري في (السيرة الصحيحة ) ( ١/١٩٤).

مەدینەوە گەیشتونەتە مەککە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) خێرا خۆی گەیاندە ئەو کۆمەڵە و لەگەڵیاندا دانیشت و پێی ووتن: ئایا شتێکی چاکترتان دەوێت لەوەی کە بۆی هاتوون؟ ووتیان: بەڵی چی یە؟ پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون:

(أنا رسول الله بعثني الى العباد أن يعبدوا الله ولا يشركوا به شيئا وأنزل عليَ الكتاب) واتە: من پێغەمبەری خوام و خوای گەورە ناردوومی بۆلای سەرجەم بەندەکانی خۆی کە تەنها ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن و کتێبی بۆ هێناومەتە خوارەوە، پاشان دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئیسلامی بۆ ڕوون کردنەوە و قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، ئەیاسی کوڕی مەعاذ کە لە هەموویان منداڵ تر بوو ووتی: ئەی خزمان وەڵاهی ئەمە چاکترە لەوەی بۆی هاتووین، ئەبولحەسیریش چنگێك لە خۆڵی هەڵ گرتوو پرژانی بە ڕوویدا و ووتی: وازمان لێ بهێنە ئەی ئەیاس بەتەمەنم ئێمە بۆ ئەمە نەهاتووین بەڵکو هاتووین بۆ کارێکی تر، پاشان ئەیاس بێدەنگ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و بەجێی هێشتن و ئەوان گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە و تووشی شەڕی قورسی (بعاث) هاتن، محمودی کوڕی لبید ووتی: ئەو خزمانەی مەعاذ کە لە کاتی سەرەمەرگدا گوێیان لێ بوو کە موعاذ (ﷺ) هەر (سبحان الله و الحمدلله و لاإله إلاالله) ی دەووت تا وەفاتی کرد و خزمانیان گومانیان نەبوو لەوەی کە بە موسوڵمانی مردووە و ووتیان: ئێمە هەر لە گوێ گرتنەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) موسوڵمان بوونمان پێوە بینیوە )[٣٦١].

ئا بەو شێوەیە جەنگی بوعاثی نێوان ئەوس و خەزرەج چاکترین خێر و بەرەکەت بوو بەسەر ئەنصارەوە:

عائشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: (شەڕی بوعاث ڕۆژێك بوو خوای گەورە پێشکەشی پێغەمبەری (ﷺ) کردبوو کاتێك شیرازەی هەموویان تێك چوو بوو، سەرگەورە و پیاوە

(٣٦١) اخرجه: احمد ( ٤٢٧/٥ )(٢٣٦١٩) وقال محققه : اسناده حسن، والطبراني في (الكبير ) (١٨٠٥)، والحاكم (٣ / ١٨٠) وصححه على شرط مسلم، والطبري (٣٥٢/٢)،والبخاري في (التاريخ الكبير) ( ٤٢٢/١) ، والبيهقي في (الدلائل ) ( ٤٢٠/٢)، وسيرة ابن هشام (٣٧/٢)، قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٦/٣) : رواه احمد و الطبراني ورجاله رجال ثقات،وقال الحافظ في (الإصابة) (٩١/١): صحيح، وقال الأرناؤوط في تحقيق (زاد المعاد) (٤٠/٣): سنده حسن رجاله ثقات.

(ﷺ) کردوه ، لێره دا بەڵگەی هەمووان دەهێنینەوه و پۆختەی ڕاستی باسە کە دەخەینە ڕوو :

لەم دوو ڕیوایەتەی خوارەوەدا وا دەردەکەوێت کە نوێژیان لەسەر نەکراوه:

**١- ئەنەس** (ﷺ) **دەفەرموێت** : (شەهیدەکانی ئوحود نوێژیان لەسەر نەکرا و نەشۆردران و بە خوێنەکانیانەوه نێژران)[٤٦٤] .

**٢- جابر** (ﷺ) **دەفەرموێت** : (پێغەمبەر (ﷺ) دوو پیاوی لە کوژراوەکانی جەنگی ئوحود کۆکردەوه لەیەك گۆڕدا و نەشۆردران و نوێژی لەسەر نەکردن)[٤٦٥] .

وه لەم (٥) ڕیوایەتەی خوارەوەدا وا دەردەکەوێت کە نوێژیان لەسەر کراوه:

**١- ئەنەس** (ﷺ) **دەفەرموێت** : (پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نەکردوه لەسەر هیچ یەکێك لە شەهیدەکانی ئوحود تەنها حەمزه نەبێت)[٤٦٦] .

**٢- ئیبن و عەباس** (ﷺ)**دەفەرموێت** : (تەرمی شەهیدەکانیان دەهێنا و دەکەس دەکەس ڕیزیان دەکرد لەلای حەمزه و پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر دەکردن ، و پاشان ئەوەیان لا دەبرد و دەی تریان دەهێنا دیسان لە پەنای حەمزەدا ڕیزیان دەکرد و پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر دەکردن و حەمزه هەر لە جیٚ ی خۆی بوو ، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر حەمزه کرد و نۆ جار (الله أکبر)ی لەسەر کرد و پاشان شەهیدەکانیان دەهێنا و ڕیزیان دەکردن و لەگەڵ ئەوانیشدا هەر نوێژی لەسەر دەکردن)[٤٦٧] .

**٣- جابر** (ﷺ) **دەفەرموێت** : (پێغەمبەر (ﷺ) حەمزەی هێناو نوێژی لەسەر کرد و پاشان شەهیدەکانیان هێناو لەلای حەمزەوه دایان دەنان و نوێژی لەسەر دەکردن)[٤٦٨] .

---

[٤٦٤] أخرجه : ابوداود (٣١٣٥) ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٨٨) .

[٤٦٥] أخرجه : البخاري (١٣٤٣) .

[٤٦٦] أخرجه : ابوداود (٣١٣٧) ،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (٢٦٩٠) .

[٤٦٧] أخرجه : ابن ماجة (١٥١٣) ، والحاكم (٣/ ١٩٧) ، والبيهقي (١٢/٤) ،وصححه الشيخ الألباني في ( صحيح ابن ماجة) (١٢٢٨).

[٤٦٨]. أخرجه : أحمد (٤٦٣/١)، والحاكم (١١٩/٢) ، وصحح إسناده الارناؤوط في تعليقه على (زاد المعاد) (٥٠٣/١) .

**٤- عبدوڵای کوڕی زوبەیر** (رضي الله عنه) **دەفەرموێت** : (پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی ئوحودا فەرمانی کرد پۆشاکێك درا بەسەر حەمزەدا و پاشان نوێژی لەسەر کرد و نۆجار (الله أکبر)ی لەسەر کرد ، پاشان پۆل پۆل شەهیدەکان دەهێنران و لەپەنای حەمزەدا دا دەنران و نوێژی لەسەر دەکردن ، وەنوێژی لەسەر حەمزەش دەکرد لە گەڵیاندا)[٤٦٩] .

**٥- ئیبن و مەسعود**(رضي الله عنه) **دەفەرموێت** : (پێغەمبەر(ﷺ) حەمزەی دانا ، پیاوێکی ئەنصاریان هێنا لە پەنای حەمزەدا دایان ناو پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد ، پاشان ئەنصاریەکەیان لابرد ، و یەکێکی تریان هێنا و لای حەمزە دایان نا و پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد ، پاشان ئەو کەسەشیان لابرد ... وە بەم جۆرە ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (ﷺ) حەفتا جار نوێژی لەسەر حەمزە کرد)[٤٧٠] .

سەبارەت بەم باسە ئیمامی تورمذي (رحمه الله) دەفەرموێت : (زانایان جیاوازیان هەیە سەبارەت بە نوێژ کردن لەسەر شەهیدەکان ، هەندێکیان دەفەرموون : نوێژ لەسەر شەهید ناکرێت ئەمەش ووتەی خەڵکی مەدینە و شافعی و ئەحمەدە ، وە هەندێکی تریان دەفەرموون : نوێژ لەسەر شەهید دەکرێت ئەمەش ووتەی خەڵکی کوفە و ثەوری و ئیسحاقە)[٤٧١] .

وەئیمامی طحاوی (رحمه الله) دەفەرموێت :(بەدووپات کردنەوەی نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر شەهیدەکان ، جگیربووە کە شەهید نوێژی لەسەر دەکرێت )[٤٧٢] .

وەئیمامی ئەحمەدیش (رحمه الله) دەفەرموێت :(نوێژکردن لەسەر شەهید باشترە، وە ئەگەر نوێژیشیان لەسەر نەکرێت هەردەبێت )[٤٧٣] .

---

[٤٦٩] أخرجه : الطحاوي (المعاني الآثار) (١/٢٩٠) ، وصححه الشيخ الألباني في (أحكام الجنائز) (ص ١٠٦) .

[٤٧٠] أخرجه : أحمد (٤٤١٤) وقال محققه الارناؤوط :حسن لغيره .

[٤٧١] أنظر : (سنن الترمذي ) باب (ماجاء في ترك الصلاة على الشهيد) الحديث (١٠٣٧) .

[٤٧٢] انظر: (شرح معاني الاثار) للإمام الطحاوي (١/٥٠٤) .

[٤٧٣] انظر: (فتح الباری)للحافظ ابن حجرالعسقلانی (٣/٢١٠- ٢١١) .

وە ئیبن وقەیمیش (رحمه الله) دەفەرمویت: (ڕاستیەکەی ئەم باسە لە وەدایە کە سەرپشکین لەوەی کە نوێژی لەسەر بکرێت یان نا ، چونکە فەرمووده و ئاسەوارێکی زۆر هەن لەسەر هەردوولا )[٤٧٤].

کەوابوو ئەتوانرێت نوێژ لەسەر شەهید بکرێت ، وە ئەتوانرێت نوێژیشی لەسەر نەکرێت، بەلاّم نوێژکردن لەسەری باشترە، شێخ ئەلبانی (رحمه الله) دەفەرمویت :
(گومانی تێدانیە کە نوێژکردن لەسەر شەهیدەکان باشترە لە نوێژنەکردن لەسەریان ، چونکە نوێژ (دووعا، وعیبادەتە)[٤٧٥].

لە دوای کۆکردنەوەی شەهیدەکان و نوێژکردن لەسەریان باسی ناشتنیان هاتە پێش، بێگومان سوپای موسوڵمانان برینداریکی زۆریان هەبوو،وە زۆرماندوو بوون ، وە نەیان دەتوانی ئەو هەموو گۆڕە ئامادە بکەن ، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری کردن (کە شەهیدەکان دوو دوو یان سێ سێ بکرێنە یەك گۆڕەوە بەلاّم گۆڕەکان قوڵ وچاك بن)[٤٧٦] .

هیشامی کوڕی عامر(ﷺ) دەفەرمویت: ئەنصار لە ڕۆژی ئوحودا هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان : بەڕاستی بریندارمان زۆرە وە زۆرماندووین (وە هەڵکەندنیش زۆرسەختە لەسەرمان ) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (( احفروا [واعمقوا] واوسعوا واجعلوا الرجلين والثلاثة في القبر..وقدموا اكثرهم قرآناً)) واتە: گۆڕەکان هەڵکەنن ، وە قوڵیان، بکەن وە فرەوانیان بکەن و دووان و سیان بکەن یەك گۆڕ وە کێیان قورئانی زۆرترە پێشی خەن بۆ ناو گۆڕەکە.

لە ڕوایەتێکی تردا دەفەرمویت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((انظروا اكثرهم جمعاً للقرآن – وفي روايه-[ أيهم كان اقرأ للقرآن][٤٧٧]. فاجعلوه امام صاحبه في القبر ، فكانوا يدفنون الاثنين والثلاثة في القبر)) واتە : تەماشاکەن کێیان قورئانی زۆرتر کۆکردوەتەوە (واتە.لەسینگی دا)

---

[٤٧٤] انظر : (تهذيب السنن) لابن القيم (٤/٢٩٥).

[٤٧٥] انظر : (احكام الجنائز وبدعها) للشيخ الالبانى المسألة (٥٩) (ص :١٠٨) .

[٤٧٦] لە ڕیوایەتێکی (ضعیف)دا هاتووە عن ابن عباس (ﷺ) : (امر رسول الله (ﷺ) بالشهداء ان يدفنوا بعد نزع الحديد والجلود عنهم) : اخرجه: ابوداود(٣١٣٤) وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف ابى داود) (٦٨٦) .

[٤٧٧] اخرجه:احمد(٢٣٦٦٠) وقال محققه الارناؤوط : اسناده صحيح على شرط الشيخين .

یاخود (کێیان قورئانی باشتر خوێندوەتەوە) ئەوەیان پێشی هاوڕێکەی بخەن بۆ ناوگۆڕەکە . ئیتر بەوجۆرە دوان وسیان دەنێژران لەیەك گۆڕدا)[٤٧٨].

لە ڕیوایەتێکی تر هەر هیشامی کوڕی عەمر دەفەرموێت : (لە شەڕی ئوحودا ، کۆمەڵێك لە مووسڵمانان شەهیدبوون ، وکۆمەڵێکیشان بریندار بوون [ئێمەش ووتمان: ئەی پێغەمبەری خودا هەڵکەندنی گۆڕ بۆ هەریەکەیان زۆر لەسەرمان گرانە ] [جاچی دەفەرموویت ؟] فەرمووی : گۆڕیان بۆ هەڵکەنن وە فراوانیان کەن [وە قوڵیان کەن] [و باشیان کەن ]و دوان و سیان بکەنە یەك گۆڕەوە ، وە ئەوەیان قورئانی زۆرترە پێشی بخەن بۆ ناو گۆڕەکە) [هیشام دەفەرموێت : (باوکم شەهید بوو بوو لەگەڵ دووکەسی تردا ، کرانەیەك گۆڕەوە و باوکم قورئانی زۆرتر بوو بۆیە پێش خرا ] )[٤٧٩].

## پێغەمبەر (ﷺ) لە خوادا دەپاڕێتەوە لە دوای تەواو بوونی جەنگەکە

لە دوای تەواوبوونی جەنگەکە و ناشتنی شەهیدەکان ، پێغەمبەر (ﷺ) داوای لە هاوەڵانی کرد کە لە دوایەوە بەڕیز بەوەستن ، پاشان دوعای کرد لە کافرەکان و سوپاس و ستایشی خوای کرد: ڕیفاعەی ئەلزورقی (ﷺ) دەفەرموێت : ( لە جەنگی ئوحودا و لە دوای پاشەکشە کردنی موشریکەکان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( ڕێك بووەستن تاسوپاس وستایشی خودا بکەم ) هاوەڵانیش لە دوایەوە لە چەند ڕیزێك دا وەستان ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :((اللهم لكَ الحمدُ كُلِهِ ، اللهم لاقابضَ لما بسطتَ ، ولاباسط لما قبضت ، ولاهادي لما اضللتَ ، ولامُضلَ لِنْ هَدَيت، ولامعطي لما منعت ، ولامانع لما اعطيت ، ولامُقرِّبَ لما باعدتَ ، ولا مباعد لما قربت . اللهم ابسط علينا من بركاتك ورحمتك وفضلك ورزقك اللهم اني

---

(٤٧٨) اخرجه: احمد (٥/٤٣١) ، وابوداود(٣٢١٥) ، و الترمذي (١٧١٣) ، النسائي (٤/١٥) ، ابن ماجة (١٥٦٠) ، والبيهقي (الدلائل) (٣/٢٩٦- ٢٩٩) ، وابن هشام (السيرة) (٦٤٤) وقال محققاه : اسناده حسن ، وصححه الشيخ الألباني في : (صحيح ابو داود) (٢٧٥٤) ، و(صحيح الترمذي) (١٤٠٠) ، و(صحيح النسائي) (١٨٩٩) .

(٤٧٩) أخرجه: ابوداود (٢/٧٠) ، والنسائي (١/٢٨٣-٢٨٤) ، والترمذي (١٠٣٦) ، وصحح اسناده الشيخ الالباني وألف بين رواياته في (احكام الجنائز) مسألة (٩٣) (ص :١٨١) .

اسالك النعيم المقيم الذي لايحولُ ولايزول ، اللهم اني اسألك النعيم يوم العَيْلة ، والأمن يوم الخوف – في رواية– [يوم الحرب] ، اللهم عائذٌ بك مِنْ شرّ ما أعطيتنا ، وشرّ مامنعتَ مِنّا، اللهم حبّب إلينا الايمان و زينّهُ في قلوبنا ، وكرِّه إلينا الكفر والفسوقَ والعصيان ، واجعلنا من الراشدين .اللهم توفنا مسلمين ، واحينا مسلمين ، والحقنا بالصالحين غير خزايا ولا مفتونين .اللهم قاتل الكفرة الذين يكذّبونَ رسُلكَ ، ويصُّدونَ عن سبيلك ، واجعل عليهم رجزك وعذابك ...اللهم قاتل الكفرة الذين اوتوا الكتاب – وفي رواية –[اللهم قاتل كفرة أهل الكتاب] إله الحق [آمين ])) (٤٨٠).

واتە : خوایە سوپاس هەمووی هەر بۆ تۆیە ، خوایە ئەوەی تۆ بیهێنیتەوە یەك فراوان کاری نیە ، وە ئەوەی تۆ فراوانی بکەی بیهێنەرەوە کاری نیە ، وە ئەوەی ڕێنووی بکەیت گومڕاکاری نیە ، وە ئەوەی تۆ گومڕای کەیت ڕێنمووی کاری نیە ، وە ئەوەی تۆ بیبەخشی ڕێگری نیە ، وە ئەوەی تۆ ڕێگری بکەیت بەخشینی نیە ، وە نزیکار نیە بۆ ئەوەی کە تۆدرووت کردوە ، و دوور کەرەوە نیە بۆ ئەوەی کە تۆ نزیکت کردۆتەوە.

خوایە بەرەکەتەکانی خۆت و بەزەیی و میهرەبانی و ڕۆزی خۆت بکەرەوە بەسەرماندا ، خوایە من داوای نیعمەتەکانی هەتا هەتایت لێدەکەم کە گۆڕان و نەمانی بەسەردا نایەت . خوایە من داوای نیعمەتەکانت لێدەکەم لە ڕۆژی تەنگانەدا ، وە داوای ئاسایشیت لێدەکەم لە ڕۆژی جەنگ و ترسدا ، خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لەخراپە و لە زیانی ئەوەی پێت بەخشیوین ، وە خراپە و زیانی ئەوەی کە لیت قەدەغە کردووین .خوایە باوەڕ خۆشەویست بکە لامان ، بیڕازێنەرەوە لە دڵەکانماندا، وە تاوان و بێ باوەڕی و خراپەمان لاناشیرین بکە و بمانکەرە ڕیزی هۆشمەندەکانەوە ، خوایە بە موسوڵمانی بمان مرێنە ، وە بە موسوڵمانی بمان ژێنە وە بمان گەیەنەرە لە پیاوچاکان ، بەبێ سەرشۆڕی و هەڵگەڕانەوە.خوایە ئەو کافرانە بە کوشتن بەرە کە پێغەمبەرەکانت بە درۆ دەخەنە وە خەڵکان دوور دەخەنەوە لە

---

(٤٨٠) اخرجه: البخاري في (الادب المفرد) (٦٩٩) ، والنسائي (الكبرى) (١٠٤٤٥) ، واحمد(١٥٤٩٢) ، والبزار (١٨٠٠) ، والحاكم (٣/٢٣-٢٤) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي ، وابن ابي عاصم (السنة) (٣٩٠) ، وقال محققه : ايسناده صحيح ، والطبراني (الكبير) (٤٥٤٩)– وفي (الدعاء) برقم (١٠٧٥)، وابونعيم (الحلية) (١٢٧/١٠)،وصحح الحديث الشيخ الألباني رحمه الله في (صحيح الادب المفرد)(٥٣٨) ، وفي (فقه السيرة)(ص:٢٨٤).

ڕێگە و ئاینەکەت ، خوایە ئەشکەنجە و سزای خۆتیان پێبگەیەنە.خوایە کافرەکانی خاوەن (کتێب) بە کوشتن بەرە ئەی خوای ڕاست (آمین) خوایە لێمان وەرگرە).

# گەڕانەوە بۆ ناو شاری مەدینە

لە دوای ئەم نزا و پاڕانەوە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی بەو هەموو برینداری و ماندووبوونەوە گەڕانەوە ناو شاری مەدینە و دانیشتوانی شارەکە لە ژن و منداڵ بەرو پیریان هاتن :

ئیبن وئیسحاق دەفەرموێت : (پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو شاری مەدینە گەڕایەوە، و حەمنەی کچی جەحشی پێگەیشت ، و خەڵکان هەواڵی شەهیدبوونی عبدولای کوڕی جەحشی برایان پێگەیاند ئەویش ووتی :(إنا لله وإنا إليه راجعون ) ، پاشان هەواڵی شەهید بوونی (حەمزەی کوڕی عبدول موطلبی خاڵیان پێگەیاند ئەویش دیسان ووتی(إنا لله وإنا إليه راجعون) پاشان هەواڵی شەهید بوونی (موصعەبی کوڕی عومەیری )مێردیان پێگەیاند هاواری کرد و زۆر نارەحەت بوو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (مێرد جێگەیەکی تایبەتی هەیە لای ژن ....)بەلاّم ئەم فەرموودەیە (ضعيف)ە[٤٨١] .

وە هەرلەم باسەشدا ئبن وئیسحاق شتێکی تردەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : (پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕبوو بەلای ئافرەتێك لە ( بنی دينار) کە براکەی و باوکەکەی و مێردەکەی هەموو شەهید بوون لە ئوحود لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)، کاتێك کەهەواڵی شەهید بوونی ئەو سیانەیان پێگەیاند ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا چی بەسەرهات ؟ ووتیان: ئەو زۆرچاکە ئەی دایکی فلاّن کەس ، ئەو سوپاس بۆ خوا چۆنت پێ خۆشە ئاوهایە . ئافرەتەکەش ووتی: نیشانم بدەن تا تەماشای بکەم ، ئەوانیش نیشانیاندا و ئافرەتەکەش کە بینی ووتی : هەموو نارەحەتیەك لە دوای بینینی تۆ بچوك دەبێت )[٤٨٢] .

---

[٤٨١] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٥٩/٣) ، وابن ماجة (١٥٩٠) ، والحاكم (٦١/٤) ، والبيهقي (الدلائل) (٣٠١/٣) ، والطبري (التأريخ) (٥٣٣/٣) ، وابن سعد(١٩١/٨).والحديث ضعيف-كما قال الشيخ الالباني في (ضعيف ابن ماجة) (٣٤٧) ، و(السلسةالضعيفة) (٣٢٣٣) ، و(ضعيف الجامع) (١٩٦٠) .

[٤٨٢] اخرجه: الطبري (التأريخ) (٥٣٢/٢) ، وابن هشام (السيرة) (٦٠/٣) رقم (٦٥١) وقال محققاه: مرسل ، والبيهقي (الدلائل) (٣٠٢/٣) ، وحسن اسناده صاحب (صحيح السيرة) برقم (٣٩٢) .

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەس (ﷺ) دەفەرموێت: (لە ڕۆژی جەنگی ئوحودا دەنگ و باسی وا بڵاوبووە بەناو خەڵکانی دانیشتووی مەدینەدا ووترا: موحەمەد کوژرا ، تا هاوار لە ناو شاری مەدینەدا بەرزبووەوە ، تا ئافرەتێك لە ئەنصار چووە دەرەوە ، و تەرمی باوکی و کوڕەکەی و مێردەکەی و براکەی کەنازانم کامیان لە پێشدا بەڕویدا هات ئافرەتەکە ووتی ئەمانە تەرمی کێن ؟ ووتیان باوکت ، و براکەت ، و مێردەکەت ، و کوڕەکەتن ، ووتی ئەی پێغەمبەری خواچی بەسەر هات ؟ ووتیان: ئەوەتە لە پێشتەوەیە تا بردیان بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئافرەتەکە لایەکی جل وبەرگەکەی پێغەمبەری گرتوو پاشان ووتی باوك و دایکم فیدات بن ئەی پێغەمبەری خوا هیچ بەلامەوە گرنگ نیە تۆ دەبینم بێ زیانیت )[٤٨٣].

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە ناو کۆڵانەکانی مەدینە ، گوێی لە ئافرەتانی ئەنصاربوو کە مێرد و خزمە شەهیدەکانی خۆیان دەلاواندەوەو بۆیان دەگریان ، بەلام کەس نەبوو بگری بۆ (حەمزەی )غەریبی دوور لە کەس و کارو خزم . بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم باسە پێویستە شێوازی گێڕانەوەکەی (أهل الحدیث) بهێنین وە پاشان شێوازی گێڕانەوەکەی (أهل السیر) بۆ باشترحاڵی بوون لە بەسەرهاتەکە:-

١ -(**أهل السیر**) وەك : موسای کوڕی عوقبەو عوروەی کوڕی ئەلزوبەیر (ﷺ) دەفەرموون : (کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە ناو مەدینە و بە کۆڵانەکانیدا تێپەڕ بوو گوێ ی لە گریانێکی زۆر بوو ، و فەرمووی:((ئەمە چی یە))؟ ووتیان ئەوە ئافرەتانی ئەنصارن بۆ شەهیدەکانیان دەگرین [پێغەمبەریش (ﷺ) لە گریانی ئەوان حەمزەی مامی بەبیرهاتەوە و دوای لێخۆش بوونی بۆ کردوو فەرمووی : (بەلام حەمزە کەس نیە ئەمڕۆ بۆی بگری لە مەدینەدا) پیاوانێکی ئەنصار وەك سعدی کوڕی موعاز ، و سعدی کوڕی عوبادە ، و موعازی کوڕی جەبەل ، وعەبدولای کوڕی ڕەواحە گوێیان لەم ووتەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ، گەڕانەوە بۆ خانووەکانیان و هەموو ئەو ئافرەتانەیان کۆکردەوە کە بۆ شەهیدەکانیان دەگریان و پێیان ووتن: سوێند بە خوا نابێت بگرین بۆ شەهیدەکانتان تا بۆ

(٤٨٣) أخرجه : الطبراني (الاوسط) (٩٧٨) ، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٠٨٧) : رواه الطبراني في الاوسط عن شيخه محمد بن شعيب ولم اعرفه وبقية رجاله ثقات .

حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) نەگرین ، چونکە باسی ئەوەی کردوەکە حەمزە هیچ کەسێکی نیە بۆی بگرێت لە مەدینەدا. وە هەمووان ڕازی بوونی پێغەمبەریان پێ خۆش بوو] ، ئنجا عبدولاَی کوڕی ڕەواحە هەموویانی هێنا بۆلای مالی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لەو گریانەبوو فەرمووی ئەمە چیە ؟ ئەوانیش بۆیان گێڕایەوە ، کە ئەنصاریەکان هەموو ئافرتەکانیان کۆکردۆتەه بۆ ئەوەی بۆ حەمزە بگرین .پێغەمبەر (ﷺ) دوای لێخۆش بوونی بۆ کردن و بە چاکەباسی کردن و (ڕازی بوون لەوانەی کە فەرمانیان داوەبەڕازی بوونی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی : (ماهذا اردت وما احب البكاء) واتە : من ئەمەم نەویستوە و گریانم پێخۆش نیە ، پاشان داوای لێ کردن کە دەست لە گریان هەلگرن و نەگرین )[٤٨٤] .

٢- ( **اهل الحديث**) :ڕیوایەتیان کردووە لە عەبدولاَی کوڕی عومەرەوە (رضي الله عنه)کە فەرمویەتی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك گەڕایەوە لە ئوحود گوێی لە ئافرەتەکانی ئەنصاری بوو (لەبنی عبدول ئەشهەل )[٤٨٥] دەگریان بۆ (مێردەکانیان کە شەهیدببوون)[٤٨٦] .

[ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فرمێسك هاتە خوارەوە لە چاوی و گریا][٤٨٧] وە فەرمووی : (لكن حمزة لا بواكي له) واتە : بەلاَم حەمزە کەس نیە بۆی بگری ئافرەتانی ئەنصاریش هەموو هاتن و بۆ حەمزە گریان ، و پێغەمبەر(ﷺ) خەوی لێ کەوت تا (لە شەو دا هەستا لە خەو وگوێی لە گریانیان بوو)[٤٨٨] ، وفەرمووی :(انتنّ ها هنا تبكين حتى الان)[٤٨٩] وفي رواية:(ويحهن ما انقلبن بعد)[٤٩٠] (انهن لها هنا)(لم يزل يبكين (يندبن حمزة) بعد منذ الليلة)[٤٩١] حتى الان ، مروهن

---

[٤٨٤] انظر: (دلائل النبوة) للبيهقي (٣/٢١٦-٣٠٠) .

[٤٨٥] اخرجه: احمد (٤٩٨٤) وقال محققه: اسناده حسن، وقال ابن كثير في (البداية) (٤/٤٨) ،على شرط مسلم.

[٤٨٦] اخرجه: الحاكم (٣/١٩٥)وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي .

[٤٨٧] اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٣/٥٩) برقم (٦٤٨) .

[٤٨٨] اخرجه: احمد (٥٥٦٣) وقال محققه الارناؤوط : اسناده حسن .

[٤٨٩] اخرجه: احمد(٥٦٦٦) وقال محققه الارناؤوط : اسناده حسن .

[٤٩٠] اخرجه: ابن ماجة (١٥٩١) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابن ماجة) (١٢٩٣) .

[٤٩١] اخرجه: احمد (٥٥٦٣)وقال محققه: اسناده حسن.

(فليسكتن )[٤٩٢]. (وليرجعن ولايبكين على هالك بعد اليوم) واتە :ئێوە لێرەن و تا ئێستا نە گەڕاونەتەوە و دەگرین بۆ حەمزە تا ئەم کاتەی شەو (پێیان بڵێن : با بێ دەنگ بن) و بگەڕێنەوە و لەسەر هیچ کەسێکی تیاچوویان لەمڕۆ بە دواوە نەگرین .

ابن وعباس(ﷺ) دەفەرموێت : ئافرەتانی ئەنصار ئەوە یان تیایە تا ئێستا بۆ هەر مردوویەك بگرین لە پێشدا بۆ حەمزە دەگرین)[٤٩٣].

# ڕاوەدوونانی موشریکەکان تا ناوچەی (حمراء الأسَد)

لە دوای تەواو بوونی جەنگی ئوحود ، و شکستی موسوڵمانان، شکۆ و سەروەریان لەکەدار بوو ، پێویست بووکە هێرشێکی ڕاوەدوونان ئەنجام بدرێت بە دوای سوپای موشریکەکان ، وە ئەوە زۆر پێویست بوو لە دوای گەیشتنی هەندێك هەواڵ کە باسی لەوە دەکرد کە گوایە موشریکەکان دەیانەوێت بگەڕێنەوە و شاری مەدینە تالآن بکەن و ئەوەی تیا ماوە لەناوی بەرن ، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) مووسڵمانی هاندا تا خۆ ئامادە بکەن بۆ ڕاوەدوونانیان ، وە دوای لێ کردن تەنها بەشداربووانی ئوحود بەشداری لەم ڕاوەدوونانە دا بکەن جگە لە (جابری کوڕی عەبدوڵا).موسوڵمانان بەو هەموو برین و ماندوو بوونەوە هەموو بەڕێکەوتن تا گەیشتنە ناوچەی (حمراء الأسد) کە (٨) میل واتە(١٤)کم دوورە لە مەدینەوە ، لەوێ ماوەیەك مانەوەو موشریکەکان ترسان و دەس بەرداری گەڕانەوە بوون ووردەکاری ئەم باسەش (اهل السير) هێناویانە لەگەڵ (اهل الحديث)دا و دوای ڕێکخستنیان باسەکە بەم جۆرە دەبێت:

موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی زوبێر(ﷺ) بە (اسناد)ی خۆیان گێڕاویانەتەوە و فەرموویانە: (پیاوێکی خەڵکی مەککە هاتەلای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەریش پرسیاری ئەبوسوفیان و سوپاکەی لێ کرد ، ئەویش ووتی :دابەزیمە ناویانەوە گوێم لێیان بوو لۆمەو

---

(٤٩٢) اخرجه: الحاكم (٣٨١/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبـي، وحسن اسناده الارناؤوط فـى تحقيقه لـ(مسند احمد) تحت الحديث رقم (٥٥٦٣).

(٤٩٣) اخرجه: الطبراني (الكبير) (١٢٠٨٦)، وقال الهيثمي في (المجمع ) (١٠١١٠): فيه يحيى بن مطيع ولم أعرفه وبقية رجاله ثقات.

گازندەی یەکتر یان دەکرد و هەندێکیان بە هەندێکیان دەووت :هیچتان نەکرد، تیژی ودڕکەکانیانتان شکاند و پاشان بەجێ تان هێشتن و لە ناوتان نەبردن ، هێشتا هەندێك سەرانیان تیاماوە خەڵکانتان بۆ کۆبکەنەوە.

لە ڕیوایەتەکەی (ئیبن وعەباس) (ﷺ) وا دەفەرمێت : (ئەبوسوفیان وموشریکەکان ئوحودیان بەجێ هێشت و بەڕێ کەوتن تاگەیشتنە ناوچەی (الروحاء) (کە(٣٦)میل لەمەدینەوەدووره)لەوێدا ئەبوسوفیان ووتی :نە موحەمەدتان کوشت ،وە نە ژنەکانتان لەگەڵ خۆتان هێنان ،خراپترین کارتان ئەنجام دا....با بۆ یان بگەڕێینەوە ، ئەم هەواڵەش گەیشتەوە پێغەمبەر (ﷺ) )[٤٩٤].

لە ڕیوایەتەکەی (عایشه) دا (رضي الله عنها) دەفەرمویت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دوای ئەوەی ئەو شکستەی بەسەر هات لە ئوحود دا ، و موشریکەکان ڕۆیشتنەوە ،پێغەمبەر (ﷺ) ترسا لەوەی کە بگەڕێنەوە بۆیە فەرموی (من ينتدب لهولاء في آثارهم حتى يعلموا أنّ بنا قوة) واتە : (کێ خۆی تەرخان دەکات تا بە شوێن پێ یاندا بڕوات تا موشریکە کان بزانن کەهێشتا خاوەن گور و هێزین )، لەوێدا حەفتا کەس خۆیان تەرخان کرد تا بە دوایاندا بڕۆن کە ئەبو بەکر و زوبەیر یان لە ناو دا بوون ( واتە : ئەمان وەك پێشینەی سوپاکەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتون پاشان پێغەمبەر و (ﷺ) پاشماوەی سوپاکە بە دوای ئەوانە دا هاتوون)[٤٩٥].

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە موسوڵمانان دا کە هەموو خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕاوەدونانی موشریکەکان ، وە بۆ ئەوەی کە ئەم هەواڵە بگاتەوە ئەوان ، موسوڵمانانیش بەو هەموو برینداریەوە[٤٩٦] ئامادەباشی خۆیان ڕاگەیاند و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :(کەس

---

[٤٩٤] اخرجه: الطبراني (الكبير) (١١٦٣٢)، والنسائي (التفسير) (١٠٣) وقال محققه: حديث صحيح ، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١١٣): رجاله رجال الصحيح غير محمدبن منصور وهو ثقه ، وقال الحافظ في (الفتح) (٢٢٨/٨) : اخرجه: ابن مردوية والنسائي ورجاله رجال الصحيح ، وقال السيوطي في (اسباب النزول)ص (٦١) وفي (الدر المنثور) (١٠١/٢) : اخرجه:النسائي وابن ابي حاتم والطبراني بسندصحيح .

[٤٩٥] اخرجه: البخاري (٤٠٧٧) ، ومسلم (٢٤١٨) ، وابن ماجة (١٢٤) ، والحاكم (٢٩٨/٤) .

[٤٩٦] وكان من بينهم من به جراحات كثيرة : فقد كان بعبدالرحمن بن عوف عشرين جرحاً (انظر: (جوامع السيرة) (ص: ١٢٨ ) ، وكان بـ أسيد بن حضير(سبع) جراحات (انظر الاصابة (١٨٥) ، وكان في بني

لەگەڵماندا نەیەت تەنها ئەوانە کە لە شەڕدا بەشدار بوون ) عەبدوڵای کوڕی ئوبەی وتی لەگەڵتاندا بێم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : نەخێر... (پاشان جابری کوڕی عەبدوڵا هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەگەڵتاندا هاتم بۆ بەشداربون لە شەڕەکە بەڵام باوکم منی گەڕانەوە ، و زۆر داوای لێکردم کە ئافرەتەکانمان جێ نە هێڵم ، ئەمەش بەهیوای ئەو شەهیدبونەی بوو کە بە دەستی هێنا ، وە بۆ ئەوەی من بمێنمەوە تا قەرزەکانی بۆ بدەمەوە و تا ئاگام لە میراتیەکەی بێت، وە من پێم خۆشە ڕوو بکەیتە هەر شوێنێك منت لەگەڵدا بم ،ئێستاش ڕێگە نادەی کەست لەگەڵدا بەشدار بێت تەنها ئەوانەی کە پێشتر لەگەڵتدا بەشدار بوون بۆیە داوات لێ دەکەم کەڕێگام بدەی تابەشدار بم لەم ڕۆیشتنە دا ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێگەی دا بەشداری بکات )[٤٩٧] (پاشان موسوڵمانان هەموو خۆیان ئامادە کردوو بەڕێ کەوتن بە دوایاندا تاگەیشتنە ناوچەی (حمراء الأسد) و بیری ئەبو عوتەیبە و موشریکەکان ئەم هەواڵەیان پێ گەیشت و نەگەڕانەوە پاشان موسوڵمانەنان بە (فضل) ی خوا گەڕانەوە بە سەربەرزی و شکۆمەندیەوە و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ﴾ (آل عمران: ١٧٢ ) )[٤٩٨] .

ئیبن واسحاق(رحمه الله) ئەم باسە بە ورد تر باس دەکات و دەفەرموێت : ( پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی دوشەمە و سێ شەمە و چوار شەمە لەوێدا مایەوە ، هەر لەوێدا (مەعبەدی کوڕی ئەبی مەعبەدی خوزاعی) پێگەیشت لەو ڕۆژەدا خوزاعە تێکڕا بە موسوڵمانان و موشریکیەکانیەوە هەموو لایەن گرو دڵسۆزی پێغەمبەر (ﷺ) بوون لە ناوچەی (توهامە)دا

---

سلمة (اربعون) جريعا، بالطفيل (ثلاثة عشر) جرحاً وكذلك بكعب ، وبخراش بن صمة (عشر) جراحات ، وبقطبة بن عامر (تسع) جراحات ، وبطلحة (اربعة وثلاثون) جرحاً (انظر: (الطبقات) لابن سعد (٢/٣٢)، و (امتاع الاسماع) للمقريزي (١/١٦٧) .

[٤٩٧] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٢١، ٣١٣) ، وفي (السنن الكبرى) (٧/١٤٧) وقال البيهقي: ...وكتبناه موصولا باسناد حسن .

[٤٩٨] اخرجه: البخاري (٤٠٧٧) ، ومسلم (٢٤١٨) ، وبعضه من رواية الطبراني (الكبير) (١١٦٣٢)، و النسائي (التفسير) (١٠٣)وقال محققه: حديث صحيح .

و هیچ هەواڵێكیان لێ نەدە شاردەوە ، مەعبەد ئەو ڕۆژە هێشتا هەر موشریك بوو ، بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت : ئەی موحەمەد سوێند بە خوا زۆر دڵگران بوین بەوەی كە توشت هات و ئەو هاوەڵانەت كە شەهید بوون ، وە زۆر پێمان خۆش بوو كە خوا سەلامەتی بكردایت لەو جەنگەدا .پاشان مەعبەد پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە (حمراْ الاسد) بەجێ هێشت بەرەو مەككە ڕۆیشت ، تا لە ناوچەی (الرّوحاء) دا بە ئەبوسوفیان و سوپاكەی گەیشت لەو كاتەدا ئەوان بڕیاری گەڕانەوەیان دابوو.... ئەبوسوفیان كە مەعبەدی بینی پێی ووت : چ هەواڵی ئەو ڕێگایەت لایە ئەی مەعبەد ؟ مەعبەدیش ووتی : موحەمەد و تێكڕای هاوەڵانی دەرچوون و بە شوێنتاندا دەگەڕێن و ئەوەندەی لەگەڵدایە تا ئێستا ژمارەی ئەوەندە زۆرم نە دیوە زۆر تورە و بە داخن لێتان ، ئەوانەش كەلەگەڵیدا نەهاتبوون بۆ جەنگەكە هەموو پەشیمان بون لەو كارەیان ، ئەوەندە لێتان بە ڕقن تا ئێستا شتی وام نەدیوە . ئەبو سوفیان وتی: ئەوە ئاگات لە خۆتە دەڵێی چی؟ مەعبەد وتی : سوێند بە خوا وا بزانم فریا ناكەویت ئێرە بەجێ بهێڵێت تا سەری ئەسپەكانی ئەوانت لێ دەردەكەوێت ، ئەم هەواڵە ئەبوسوفیان وسوپاكەی سارد كردەوە لە گەڕانەوە، وە لەڕێدا چەند كاروان چیەكی خێڵی (عەبد قەیسی) پێگەیشت و پێی ووتن : بەرەو كوێ دەچن ؟ ووتیان : بەرەو مەدینە. ئەبو سوفیان ووتی بۆچی دەچن بۆئەوێ ؟ ووتیان: بۆبازرگانی دەچین .ئەبو سوفیان ووتی: ئێوە نامەیەكی من بگەیەننە موحەمەد منیش چەند بارێك مێوژتان دەدەمێ گەر ئێوە هاتنە بازاڕی (عوكاظ)؟ ووتیان : باشە ئەبوسوفیان ووتی: گەر بە موحەمەد گەیشتن پێی ڕاگەیەنن كە ئێمە بڕیارمان داوە جارێكی تر هێرشیان بێنینەوە سەر تا پاشماوەكانیان ڕیشە كێش بكەین. كاروانە كە بەڕێكەوتن و لەناوچەی (حمراء الأسد) بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتن و نامەكەی ئەبوسوفیانیان پێگەیاند، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ((حسبنا الله ونعيم الوكيل)) )[٤٩٩] ، پاشان لە ڕۆژی چوارشەمە دا پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی شكۆمەندانە گەڕانەوە ناو شاری مەدینە. لە ڕیوایەتێكی( ضعيف ) دا هاتووە كە لە گەڕانەوە دا شاعیری موشریكەكان ئەبو عیزەی جومەحی و معاویەی كوڕی موغیرە

---

[٤٩٩] انظر : (السيرة) لابن هشام (٣/٦٣– ٦٤) برقم (٦٥٨) وقال محققاه : اسناده معضل ، و(التأريخ) للطبري (٢/٥٣٥) ، و(الدلائل) للبيهقي (٣/٣١٥) .

کوژراون بە دەستی موسوڵمانان. ئەبو عوبەیدە (ﷺ) دەفەرموێت: ( پێغەمبەر(ﷺ) لە گەڕانەوەیدا لە (حمراء الأسد) وە پێش گەیشتنەوەی بە شاری مەدینە ، دوانی دەست گیرکرد کە ئەوانیش موعاویەی کوڕی موغیرەی کوڕی عاص لەگەڵ (أبو عزة)ی شاعیری موشریکەکان (کە لە بەدردا پێغەمبەر (ﷺ) بێ بەرامبەر ئازادی کرد بە مەرجێك بەشداری هیچ چالاکیەك نەکات دژ بە موسوڵمانان) ئەبو عیزە وتی : موحەمەد ئازادم کە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) پێی ووت: ((لا والله لاتمسح عارضيك بمكة بعدها وتقول :خدعت محمدًا مرّتين)) .

واتە : نەخێر سوێند بە خوا جارێکی تر دەست بە هەردوو لای سمێڵتا ناهێنیت بڵێیت موحەمەدم دووجار خەڵەتان پاشان لە ملی درا)[٥٠٠]

عبدولای کوڕی ئوبەی سەرکردەی ناوداری دووڕووەکان لە یەکەم جومعەی دوای جەنگی ئوحودا وویستی نیازپاکی و لایەنگری خۆی وەك جاران دوپات بکاتە وە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و موسوڵمانان ، دوای ئەوە کە سێیەکی سوپاکەی لە گۆڕەپانی جەنگدا گێڕایەوە :

ئیبن و ئیسحاق (رحمە الله) دەفەرموێت : ( عبدولای کوڕی ئوبەی یەکێك بو لە پیاو ماقوڵانی تیرە و هۆزەکەی خۆی ، لە هەموو کۆبونەوەی جومعەیەك دا لە ناو هەمواندا هەڵدەسا و لایەنگری و سەرخستنی خۆی بۆ پێغەمبەر دووپات دەکردەوە.... تائەوە بو ئەوکارە نا بەجێیەی ئەنجام دا لە ئوحود دا و سێیەکی سوپاکەی گەڕاندەوە. لە دوای ئەوە وەك جاران دیسان ویستی لە جومعەدا هەڵسێت لە ناو خەڵکەکەدا و لایەنگری خۆی دوپات بکاتەوە ، عبدولا ئەمجار کە ویستی هەڵسێت ، مووسڵمانان لە هەموو لایەکەوە جل و بەرگەکەیان گرت و پێیان ووت: دانیشە ئەی دوژمنی خوا تۆ ئەو پیاوە نیت دوای ئەوەی ئەو کارەت ئەنجام دا ؟! عبدولاش بەسەر خەڵکاندا هەنگاوی دەنا بۆ چونەدەرەوە لە مزگەوت و دەی ووت : هەستاوم لایەنگری دەکەم دەڵێ ی قسەی ناشیرینم کردوە. پیاوێکی ئەنصاری لە دەرگای مزگەوت دا پێی گەیشت و پێی ووت : کورە بگەڕێرەوە تا پێغەمبەر

---

(٥٠٠) أخرجه : ابن هشام (السيرة) (٦٥/٣) برقم (٦٦٠) وقال محققاه : اسناده منقطع ، واخرجه ايضاً : البيهقي (الدلائل) (٢٨١/٣) ، وفي (السنن الكبرى) (٦٥/٩) (٣٢٠/٦) وقال : اسناده ضعيف ، وضعفه الشيخ الألباني في (الارواء) (١٢١٥) .

داوای لێخۆشبوونت بۆ بکا ؟ ووتی: وەڵا نامەوێت داوای لێخۆش بوونم بۆبکات)[٥٠١].

ئەم باسەش نزیکە لەئایەتێکی خوای گەورەوە کە لە (وصف)ی ئەو دوو ڕوانەدا دەفەرمووێت :﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ ﴾ (المنافقون: ٥ ) .

هاوەڵانی پێغەمبەر هەڵوێستیان نا جۆر بوو سەبارەت بەو دوو ڕووانەی کە گەڕابونەوە لە جەنگی ئوحود ، زەیدی کوڕی ثابت (ﷺ) دەفەرمووێت : ( کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ئوحود ڕۆیشت کە سانێك لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون گەڕانەوە).

هاوەڵانی پێغەمبەریش (ﷺ) سەبارەت بەوان دوو کۆمەڵ بوون : کۆمەڵێکیان دەی وت : (دەیان کوژین ) ، وەکۆمەڵەکەی تریان دەیان ووت :نا نایان کوژین ، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾ ﴾ (النساء: ٨٨ ) دوا جار پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((إنها طيبة ، وإنها تنفي الخبث كما تنفي النارُ خبث الفضة)) واتە : ئەوە شاری طیبة (واتە مەدینە) یە ، کە پیسی فڕێ دەدات وەك چۆن ئاگر ژەنگ و پیسی زیوو ڕێدەدات )[٥٠٢].

ئیبن و ئیسحاق دەفەرمووێت : (بە ڕاستی ڕۆژی ئوحود ڕۆژی توش بوون و تاقیکرنەوە و پاك کردنەوە بوو خوای گەورە باوەڕدارانی تیادا تاقی کردەوە ، وە تیایدا ئەو دووڕووانەی کە بەزمانیان باوەڕی خۆیان ئاشکرا دەکرد ،و بێ باوەڕیان لە دڵیاندا دەشاردەوە ئالە و ڕۆژەدا خوا ئاشکرا و ڕسوای کردن . وە ئەوە ڕۆژێك بوو کە خوای گەورە هەندێك لە پیاو چاکانی خۆی ڕێزدار کردو ڕێزو پلەی شەهیدی پێ بەخشین)[٥٠٣].

---

[٥٠١] أخرجه : ابن هشام (السيرة) (٦٦/٣) برقم (٦٦١) باسناد مرسل عن الزهري ، وأورده البيهقي (الدلائل) (٣١٨/٣) ، وابن كثير (البداية) (٥٩/٤) .

[٥٠٢] أخرجه : أحمد (٢١٥٩٩، ٢١٦٣٦) ، وابن ابي شيبة (٤٠٦/١٤) ، والبخاري (٤٠٥٠) ، ومسلم (٢٧٧٦) ، والبيهقي (الدلائل) (٢٢٢/٣) واللفظ لأحمد .

[٥٠٣] أنظر : سيرة ابن هشام (٦٧/٣).

# پلەی بەرزی شەهیدەکانی ئوحود

**شەهیدەکانی شەڕی ئوحود چەند تایبەت مەندیەکیان هەیە لەوانە:**

**١- سەروەر و گەورەی هەموو شەهیدەکانی دونیایان تێدایە :**

**جابر(ﷺ) دەی گێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی :**

((سيد الشهداء عند الله تعالى يوم القيامة حمزة بن عبدالمطلب...))[٥٠٤] **واتە سەروەری هەموو شەهیدەکان لای خوای گەورە لە قیامەت : حەمزەی کوڕی عبدول مطللیبە**

**٢- شەهیدەکانی ئوحود لە ناو سکی چەند باڵندەیەکی سەوز دان دەچنە ڕووبارەکانی بەهەشت و لەبەروبومەکانی دەخۆن و دەگەڕێنەوە بۆ لای چرا ئاڵتونیە هەڵواسراوە کان لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا :**

**ئیبن عەباس (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری (ﷺ) ی خواوە کە فەرمویەتی :** ((لما أصيب إخوانكم بأحدٍ ، جعل الله عزوجل أرواحهم في جوف –في رواية– [أجواف] طير خضر ترد انهار الجنة ، وتأكل من ثمارها ، وتأوي إلى قناديل من ذهب [معلقة] في ظل العرش ، فلما وجدوا طيب مشربهم ومأكلهم وحسن مقيلهم – في رواية – [حسن منقلبهم] قالوا : ياليت إخواننا يعلمون بما صنع الله لنا ، لئلا يزهدوا في الجهاد ، ولا ينكل عن – في رواية – [عند] الحرب وفي رواية [من يبلغ إخواننا [عنا]أنا في الجنة نرزق ]فقال الله عزوجل أنا أبلغهم عنكم.فأنزل الله عزوجل هؤلاء الآيات على رسوله :﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران: ١٦٩) )[٥٠٥] **واتە : برایانتان کاتێك پێکران وشەهید کران لە ئوحود دا ، خوای گەورە ڕۆحەکانیانی کردە ناو باڵندەیەکی سەوزەوە دەچێتە ڕوبارەکانی بەهەشت وە لە میوەی درەختەکانی دەخوات ، وە دەگەڕێتەوە بۆ لای**

---

[٥٠٤] أخرجه : الحاكم (١٩٩/٣) وصححه و وافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٣١٥٧).

[٥٠٥] خرجه : أحمد (٢٣٨٨) وقال محققه : حديث حسن ، وابن أبي شيبه (٢٩٤/٥)، وابن أبي عاصم (السنة) (١٩٥) ، وأبو داود (٢٥٢٠) ، والحاكم (٨٨،٢٩٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، والبيهقي (الكبرى) (١٦٣/٩) ، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح أبي داود) (٢١٩٩) واللفظ لأحمد والحاكم .

چرا ئاڵتونیە هەڵواسراوەکانی ژێر سێبەری عەرش ، شەهیدەکان کە ئەو جێگەو خواردن و خواردنەوە باشەیان دی ووتیان : خۆزگە برایانمان دەیان زانی کە خوای گەورە چی بۆ کردوین ، تا کۆڵنەدەن لە خەبات کردن ، وە نەبەزین لە کاتی جەنگ دا [کێ بە برایانمان ڕادەگەیەنێت کە ئێمە لە بەهەشت داین و ڕۆزیمان پێدەدرێ]؟ خوای گەورەش فەرمووی من لەجیاتی ئێوە پێیان ڕادەگەیەنم ئنجا خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران: ١٦٩).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبن و مەسعود (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرمویەتی : (أرواحهم في جوف طير خضر ، لها قناديل معلقة بالعرش ، تسرح من الجنة حيث شاءت ، ثم تأوي إلى تلك القناديل ، فأطلع إليهم ربهم إطلاعة ، فقال : هل تشتهون شيئاً ؟ قالوا أي شيء نشتهي ؟ ونحن نسرح في الجنة حيث شئنا – وفي رواية [فيقول : سلوني ما شئتم ؟ قالوا ربنا وماذا نسألك ، ونحن نسرح في الجنة في أيها شئنا] ففعل ذلك بهم ثلاث مرات ، فلما رأوا أنهم لن يتركوا من أن يسألوا ، قالوا : يارب نريد أن ترد أرواحنا في أجسادنا حتى نقتل في سبيلك مرة أخرى ، فلما رأى أن ليس لهم حاجة – وفي رواية – [أنهم لا يسألون إلا ذلك] و تركوا))[٥٠٦] . واتە : ڕۆحی شەهیدەکانی ئەحود لە ناو باڵندەیەکی سەوزدان کە جێگەکەی چەند چرایەکی هەڵواسراوە بە (عەرشەوە) دەردەچێت بە ناو بەهەشت دا بۆ هەر جێگەیەك کە ویستی لێی بێت ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆلای ئەو چرایانە ،....و خوای گەورە پێی فەرموون : ئارەزووتان لە چ شتێك هەیە؟ ئەوانیش ووتیان : ئارەزوومان لە چ شتێك هەبێت؟ ئێمە دەچین بەناو بەهەشت دا بۆئەو جێگەیەی کەخۆمان ویستمان لێیەتی؟ [خوای گەورە دەفەرموێت داوام لێبکەن چیتان دەوێت ؟... ] سێ جار بەم جۆرە پرسیاری لێکردن .ئەوانیش زانیان کە وازیان لێ ناهێنرێت تا دوا نەکەون ووتیان :خودایە دەمانەوێت ڕۆحەکانمان بگەڕێتەوە ناو لاشەکانمان تا جارێکی تر لەپێناوی تۆدا بکوژرێین کەبینرا ئەوان هیچ پێویستیەکیان نیە و تەنها ئەو داوایەیان هەیە وازیان لێ هێنرا . کەوا بوو ئەم

---

[٥٠٦] أخرجه : مسلم (صحيح) (١٨٨٧) ، والترمذي (٣٠١١) ، وابن ماجة (٢٨٠١).

پۆلە شەهیدەی ئوحود لە ناو بەهەشت دان بەلآم سەرجەم شەهیدانی تری موسوڵمانان لە قەراغی ڕووبارێکن لای دەرگای بەهەشت ، عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی : ((الشهداء على بارق نهر بباب الجنة، في قبة خضراء يخرج إليهم رزقهم من الجنة بكرة وعشيا))[٥٠٧] واتە: شەهیدەکان لە قەراغ ڕووبارێکدان لە دەرگای بەهەشت ، لە گومەتەیەکی سەوز دان ڕۆزییان بۆ دەردەچێت دەهێنرێت لە بەهەشتەوە هەموو بەیانیان و ئێوارانێك .

لە شەهیدانی ئوحود دا هەیە کە بەبێ پەردە لەگەڵ خوادا گفتوگۆی کردوە ، جابری کوڕی عبدولا (ﷺ) دەفەرموێت : ( کاتێك عبدولای کوڕی عەمری کوڕی حەڕامی باوکم شەهیدکرا پێغەمبەرم (ﷺ) پێگەیشت و فەرمووی :(ياجابر مالي أراك منكرا) ؟ واتە: جابر بۆ چی دەت بینم پەشێوو دڵ شکاوی؟ منیش وتم : ئەی پێغەمبەری (ﷺ) خوا باوکم شەهید بوە (قەرزاری و خێزان و منداڵی بە جێ هێشتوە) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :((أفلا ابشرك بما لقي الله به أباك – وفي رواية– : [ألا أخبرك ما قال الله عزوجل لأبيك]))؟ واتە : ئایا مژدەت بدەمێ و پێت ڕاگەیەنم کە باوکت چۆن بە خوا گەیشتوە و چی پێ ووتوە؟ منیش ووتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (ما كلم الله أحدٌ قط إلا من وراء حجابٍ ، وأحيى أباك فكلمه كفاحاً ، فقال : تمنَّ عليَّ اعطيك ؟ قال يارب : تحيني ، فأقتل فيك ثانية ، قال الرب تبارك وتعالى إنه قد سبق مني إنهم إليها لايرجعون . قال : رب فأبلغ من وارءي))قال جابر: فأنزل الله تعالى﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران: ١٦٩)).[٥٠٨] واتە : خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵ کەس نەکردوە تەنها لە ودیوی پەردەوە نەبێت ، بەلآم باوکی تۆی زیندو کردەوە و ڕووبەڕو

---

[٥٠٧] أخرجه:أحمد (٢٦٦/١) ، وابن ابي شيبة (٢٩٠/٥)، والطبري (التفسير)(٢٣٢٣) ، والطبري (الكبير) (١٠٨٢٥)، والحاكم (٧٤/٢) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي ، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٣٧٤٢) .

[٥٠٨] أخرجه : الحميدي (١٢٦٥) ، الترمذي (٣٠١٠) ، ابن ماجة (١٩٠) ، وابن حبان (٧٠٢٢) ، ةوقال محققه : اسناده جيّد ، والحاكم (٢٢٠٣/٣) وصححه و وافقه الذهبي ، والبزار (٢٧٠٦) ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (٢٤٠٨) , و(صحيح ابن ماجة) (١٥٧) ، و(ضلال الجنة) (٦٠٢) .

گفتوگۆی لەگەڵدا کرد بێ پەردە و فەرمووی : ئاوات بخوازە و داوام لێ بکە با بت دەمێ؟ عبدوڵا ووتی : خودایە زیندوم بکەرەوە تا دوبارە لە پێناوتا بکوژرێم ، خوای گەورە فەرمووی : پێشتر بڕیارم داوە کە ئەوان جارێکی تر بۆئەوێ ناگەڕێنەوە ، عبدوڵا وتی : خوایە ئەم هەواڵمان بگەیەنە ئەوانەی دوامان . جابر دەفەرمویێت خوای گەورە ئەوە ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾(آل عمران: ١٦٩). لاشەی ئەو شەهیدانش نەڕزا ، جابر (ﷺ) دەفەرمویێت: ( باوکم بینی لە گۆڕەکەیدا کاتێك هەڵمان دایوە وەك خەوتو وابوو وە جەستەی هیچ نەگۆڕا بوو وە تێك نەچوو بوو نەکەم نەزۆر ، پێیان وت : ئەی کفنەکانیت بینی ؟ووتی: کاتێك نێژرا تەنها پارچە پۆشاکێك هەبوو دەم و چاوی پێ داپۆشرا و گیای (الحرمل) درا بەسەر قاچەکانیدا ، دوای ئەو پۆشاکەشمان دی وەك خۆی بوو ،وە گیایە (الحرمل)ە کەشی وەك خۆی هەر لەسەر هەردوقاچی مابوەوە لەدای چل و شەش ساڵ )[٥٠٩].

٣- پێغەمبەر (ﷺ) گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحودی ناو نا (گۆری براکانمان) وە گۆڕستانی (بەقیع)ی مەدینەی ناو (گۆڕی هاوەڵانمان) .ڕەبیعەی کوڕی (الهدیر) دەڵێت : (طلحەی کوڕی عوبەیدیلا پێی وتم : (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) چوینە دەرەوە[بۆ گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود ] ، ڕۆیشتین تا سەرکەوتین بەسەر (حرة الواقم )لە ناوچەی (بیداء) لەوێشەوە شۆڕبوینەوە بەرەوخوار و بەلای هەندێك گۆڕی نزمدا ڕۆیشتین وتمان ئەمە گۆڕستانی براکانمانە؟ پێغەمەر(ﷺ) فەرمووی : (([هذه]قبور أصحابنا)) واتە : ئەوە گۆڕستانی هاوەڵانمانە ، پاشان لەوێ دەرچوین تاگەیشتینە گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود ، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی : (هذه قبور إخواننا) (واتە : ئەوە گۆڕستانی برایانمانە )[٥١٠].

٤ - پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەتایبەتی سەردانی گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحودی دەکرد :ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەفەرمویێت :( پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی گۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحودی

---

(٥٠٩) اخرجه: ابن سعد (الطبقات الكبرى) (٥٦٢/٣) ، ومالك (الموطأ) (٤٧٠/٢) و سنده صحيح كما قال الارناؤوط في تحققه ل(زاد المعاد) (٢١٦/٣) .

(٥١٠) اخرجه: أحمد (١٣٨٧) و قال محققه الارناؤوط : إسناده حسن ، و ابو داود (٢٠٤٣) ، وصححه الشيخ الألباني (رحمه الله) في (صحيح ابي داود) (١٧٩٧) .

دەکرد ، هەرکە دەگەیشتە لای خوارەوەی شیوەکە دەی فەرموو :﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾(الرعد: ٢٤)، واتە : سڵاوتان لێ بێت بۆ ئەو ئارام گریەتان کە دوا جار باشترین جێگەتان بەرکەوت ، پاشان ئەبو بەکریش (ﷺ) لە دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەروای دەکرد ، وە عومەریش(ﷺ) لە دوای ئەبوبەکر هەر وای دەکرد وە ، عوسمانیش (ﷺ) لە دوای عومەرە وە هەروای دەکرد)[٥١١].

٥- پێغەمبەر(ﷺ) پێش وەفاتی هات بۆ سەرگۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود وەك ماڵ ئاواییەك و بۆ دواجار نوێژی لەسەرکردن ، عوقبەی کوڕی عامیر(ﷺ) دەفەرموێت : (پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك لە مەدینە چووە دەر بۆسەرگۆڕستانی شەهیدەکانی ئوحود و نوێژی مردوی لەسەرخوێندن ،پاشان گەڕایەوە و چووەسەرمینبەرەکەی [ئەمەش وەك ماڵ ئاوایەك بوو لەزیندوەکان ومردووەکان])[٥١٢].

٦- پێغەمبەر(ﷺ) هەر کات باسی شەهیدەکانی ئوحود بکرایە ، خۆزگەی دەخواست کە (ئەویش لەگەڵیاندا شەهید بووایە، جابر(ﷺ) دەفەرموێت : هەر باسی شەهیدەکانی ئوحود بکرایە گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((أما والله لو دِدْتُ أني غودِرْت[أي : استشهدت ] مع اصحاب نُحصِ الجبل ))[٥١٣].

واتە : بەڵام من سوێند بە خوا پێم خۆش بوو لەگەڵ هاوەڵانی دامێنی چیاکە بڕۆیشتمایە (واتە : شەهید بووایە).

٧ - پێغەمبەر(ﷺ) خێزانی شەهیدەکانی ئوحودی بە سەرکردەوە.بیشری کوڕی عەقرەبە (ﷺ) دەفەرموێت: (گەیشتم بەپێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحود دا وپێم ووت : باوکم چی لێ هات؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی : ((استشهد رحمة الله)) واتە: شەهید بوو ڕەحمەتی خوای لە سەربێت .ئیتر منیش گریام ، پێغەمبەر(ﷺ) منی گرت و دەستی هێنا بە سەرمدا ، و لەگەڵ خۆی سواری کردم و پێی فەرمووم : ((اسکت [مایبکیك] أما ترضى أن اكون أنا

---

[٥١١] اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣/٣٠٦ ٣٣٣) .

[٥١٢] اخرجه: البخاري ( ١٣٤٤ ) ، و مسلم (٢٢٩٦-٢٢٩٧) والفظ له.

[٥١٣] اخرجه : احمد (١٥٠٢٥ ) وقال محققه الارناؤوط :اسناده حسن ، والحاكم (٢/٧٦) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، والبيهقي (الدلائل) (٣/٣٠٥).

أبوك وعائشه امُك ؟))[٥١٤]. واته : بێ دەنگ به (چی دەتگریەنێت )ئەی ڕازی نابیت کەمن باوکت بم وەعائیشەش دایکت بێت) .

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی خێزانی حەمزەی (ﷺ) کرد . موحومەدی کوڕی یەحیا لە خەولەی کچی فەهد کە خێزانی (حەمزەی کوڕی عەبدول موطلیب) (ﷺ)، دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی :(لە دوای شەهیدبوونی حەمزە ، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ سەردانم و پێم ووت : ئەی پێغەمبەری خوا من پێم خۆش بوو کە پێت بگەم تا پرسیاری شتێکت لێ بکەم ، بۆیان باس کردووم تۆحەوزێکت هەیە لە نێوان ئەوێ وە تائەوێ دەبێت ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :((أجل و احبُّ الناس إليَّ – أو– من احب النّاس إليّ أن يرده قومُك)) واته : بەڵێ خزمانی تۆ خۆشەویست ترین کە سانن لای من کە بێن ولێ ی بخۆنەوە.

خەولە دەڵێت : خواردنێکم لە لەگەنێکدا (یاخود قاپێکدا) لێ نزیک کردەوە کە دەستی بۆ برد گەرمای خواردنەکە گەیشت بەدەستی و سوتاو فەرمووی : ((ئاه)) پاشان فەرمووی: ((إن ابن آدم إنْ أصابهُ حرٌّ قال : حسِ ، و إن اصابته بردٌ قال:حسِ))[٥١٥] واته : ئادەمیزاد گەر گەرمی بەرکەوێت دەڵێت : ئاه، وە گەر ساردیشی بەرکەوێت هەر دەڵێت ئاه.

---

[٥١٤] اخرجه : البخاري (التاريخ الكبير) (٧٨/٢/١) ، وابن عساكر(التاريخ ) (٣٧٧/٣) ، والبزار (٣٨٥/٢) (١٩١٠) ، وحسن اسناده الشيخ الألباني فى (الصححية) (٣٢٤٩).

[٥١٥] اخرجه:الطبراني (الكبير) (٢٤ /٥٨٩) ) ، وابن ابى عاصم (السنة) (٧٠٥) ، وقال الشيخ الالبانى فى (ظلال الجنة) (٧٠٥) : اسناده صحيح على شرط الشيخين .واللفظ للطبراني.

# سەرچاوەکان

١- القرآن الكريم .
٢- اسباب النزول / أبي الحسن الواحدي النيسابوري/ علم الكتب / بيروت/ ١٣١٦هـ.
٣- امتاع الاسماع / أبو عباس أحمد المقريزي/ تح: محمود شاكر/ مطبعة بيروت/ ط٢/١٣٩٠هـ.
٤- الأدب المفرد / الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / ترتيب: محمد فؤاد عبد الباقي / الطبعة السلفية / القاهرة .
٥- الأذكار المنتخبة من كلام سيد الأبرار / الأمام يحيى بن شرف النووي / تح: عبد القادر الأرناؤوط/ دار العلوم / بيروت .
٦- الأستيعاب في معرفة الأصحاب / الأمام ابن عبد البر القرطبي / . دار العلوم الحديثة / الرباط / ط١ / ١٣٢٨هـ .
٧- الأسماء والصفات / الحافظ البيهقي/ تح: عبدالله الحاشري / مكتبة السوادي/ جدة/ ط١/١٤١٣هـ.
٨- الأسراء و المعراج / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتبة الإسلامية /عمان /ط١ / ١٤٢١هـ .
٩- الإصابة في تميز الصحابة / الحافظ ابن حجر العسقلاني / دار العلوم الحديثة / الرباط / ط١ / ١٣٢٨هـ .
١٠- الفهرست الموضوعي لآيات القرآن الكريم / جمع وترتيب: محمد مصطفى محمد / بغداد / الطبعة الثانية / ١٩٨٤م .
١١- إتحاف الخيرة المهرة / الإمام أحمد بن أبي بكر بن إسماعيل البوصيري / تح: عادل بن سعد ، و السيد بن محمود / مكتبة الرشد/ الرياض/ط١/ ١٤١٩ هـ.
١٢- أحكام الجنائز وبدعها/ الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي/ دمشق / ط١ / ١٩٦٩ .
١٣- اسد الغابة / ابن الأثير / دار احياء التراث العربي / بيروت ـــ لبنان .
١٤- إرواء الغليل / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني/ المكتب الإسلامي / بيروت / ط١/ ١٩٧٩م .

١٥-بداية السول في تفصيل الرسول (ﷺ)/ العز بن عبد السلام / تح: الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتبة الاسلامي / بيروت.
١٦- البداية والنهاية / الحافظ عماد الدين إبن كثير / طبعة دار إبن كثير / بيروت / لبنان.
١٧-بلوغ المرام من أدلة الأحكام / الحافظ ابن حجر العسقلاني / تح:محمد امين ، عبد الواهب عبد اللطيف/ دار الرائد العربي / بيروت /ط٢/ ١٩٨٧م.
١٨-التأريخ الكبير/ الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / طبعة دائرة المعارف / العثمانية / الهند/١٣٨٠ هـ .
١٩-تأريخ الأمم و الملوك / الأمام محمد بن جرير الطبري / تح: محمد ابو الفضل ابراهيم / دار المعارف / القاهرة / ١٩٧٠م .
٢٠- تأريخ الأسلام / الإمام شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان الذهبي / تح: عمر عبد السلام التدمري / دار الكتاب العربي / بيروت / ط ٢ / ١٤٠٩ هـ .
٢١- تأريخ بغداد / أحمد بن علي الخطيب البغدادي/ تصح: محمد سعيد / مطبعة السعادة / مصر.
٢٢- تأريخ خليفة بن خياط / تح: د. أكرم ضياء أحمد/ مؤسسة الرسالة/ بيروت/ ط٢/ ١٣٩٧هـ.
٢٣- تأريخ دمشق / إبن عساكر الدمشقي (ت: ٥٧١ هـ) / تح: مجموعة من الباحثين / نشر مجمع اللغة العربية / دمشق .
٢٤- تأريخ واسط / اسلم بن سهل الواسطي المعروف بـ(بحشل)/ تح: كوركيس عواد / عالم الكتب / بيروت / ١٤٠٦ هـ .
٢٥- تحريم الآت الطرب / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني/ مكتب الدليل /ط١/ ١٤١٥ هـ .
٢٦- الترغيب والترهيب / الحافظ عبد العظيم بن عبد القوي المنذري / تح: محمد محي الدين عبد الحميد / المكتبة التجارية / القاهرة / ط١ / ١٩٦٢، مع طبعة: دار إبن كثير / بيروت / تح: محى الدين مستو / يوسف علي بديوي / ط٣ / ١٤١٩ هـ .
٢٧- تقريب الحديث/ ابن قتيبة الدينوري/ تح: عبدالله الجبوري/ مطبعة العاني/ بغداد/ ط١/ ١٣٩٧هـ .
٢٨- تفسير القرآن العظيم / الحافظ عماد الدين أبو الفداء إبن كثير / دار ومكتبة الهلال .

٢٩- تفسير النسائي / الأمام احمد بن شعيب النسائي / تح: صبري عبدالخالق ـ سيد بن عباس / مؤسسة الكتب الثقافية / بيروت / ط١/ ١٩٩٠م.

٣٠- التلخيص الجير/ الحافظ ابن حجر العسقلاني / تح: د.شعبان بن محمد اسماعيل / مكتبة الكليات الأزهرية /ط١/١٣٩٩هـ.

٣١- تهذيب الأثار / الإمام محمد إبن جرير الطبري / تح: محمود شاكر / مطبعة المدني/ القاهرة/ط١ .

٣٢- تهذيب سنن ابى داود / ابن القيم الجوزية/ تح: احمد شاكر ، حامد الفقي/ مطبعة انصار السنة المحمدية / القاهرة/ ط١/١٣٦٨هـ.

٣٣- الثمر المستطاب / الشيخ محمد ناصرالدين الألباني / مؤسسة اعراس / الكويت / ط١ / ١٤٢٢هـ .

٣٤- الجامع الأحكام القران / محمد بن احمد القرطبي / تح : احمد عبدالعليم / دار الكتاب العربي / القاهرة / ١٩٦٧م – مع طبعة :دار العروبة / الكويت / ط٢ / ١٩٨٧م .

٣٥- جامع البيان عن تأويل آية القرآن / الإمام محمد إبن جرير الطبري / دار الفكر / بيروت / ١٩٨٨م .

٣٦- الجامع الصغير في أحاديث البشير النذير / الإمام جلال الدين عبد الرحمن السيوطي / تح: محمد محي الدين عبد الحميد / مطبعة حجازي / القاهرة / ط١/ ١٣٥٢هـ.

٣٧- الجامع الصحيح مما ليس في الصحيحين/ الشيخ مقبل بن هادي الوداعي/ دار الحرمين للنشر / القاهرة / ١٩٩٥م .

٣٨- حجاب المرأة المسلمة في الكتاب والسنة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / جامعة القاهرة / مصر / ط٥ / ١٣٩٨هـ .

٣٩- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء / الحافظ أبونعيم الأصبهاني / المكتبة السلفية / بيروت / وطبعة القاهرة / دار الكتاب العربي / ١٩٨١م .

٤٠- الخصائص الكبرى / الإمام جلال الدين عبد الرحمن السيوطي / تح: محمد خليل هراس / دار الكتب الحديثة / القاهرة

٤١- خطبة الحاجة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٣/ ١٣٩٧هـ .

٤٢- خلاصة اليدر الميز / الحافظ ابن الملقن / تح: حمدي السلفي / مكتبة الرشد/ الرياض / ط١ /١٩٨٩م .

٤٣- خلق أفعال العباد / الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / مؤسسة الرسالة / بيروت / ط١/ ١٩٨٤م.

٤٤- الدر المنثور في التفسير بالمأثور/ الحافظ جلال الدين السيوطي / دار المعرفة / بيروت .

٤٥- الدررفي اختصار المغازي والسير / الحافظ يوسف بن عبد البر النمري / دار الكتب العلمية / بيروت / ط١/ ١٤٠٧هـ .

٤٦- الدعاء / سليمان بن احمد الطبراني : تح : محمد سعيد البخاري / دار البشائر الإسلامية / بيروت / ط١ / ١٤٠٧هـ

٤٧- دفاع عن الحديث و السيرة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت .

٤٨- دلائل النبوة / الحافظ أبو نعيم الأصبهاني / تح: محمد رواس القلعجي / دار إبن كثير ، مع طبعة: دار النفائس / ط٣ /١٩٩١م / بيروت / لبنان .

٤٩- دلائل النبوة / الحافظ أحمد بن حسين البيهقي / تح: عبد المعطي قلعجى / دار الكتب العلمية / بيروت / ١٤٠٥هـ .

٥٠- ذم الكلام واهله / ابي اسماعيل الهروي / تح : عبد الله بن محمد الأنصاري / مكتبة الغرباء الأثرية / المدينة المنورة / ط١ / ١٤١٨هـ .

٥١- رياض الصالحين / الإمام أبي زكريا يحى بن شرف النووي / تح: عبد العزيز رباح وأحمد يوسف الدقاق / مراجعة: الشيخ شعيب الأرناوؤط / دار الثقافة العربية / دمشق / ط٢ / ١٩٩٢م .

٥٢- زاد المعاد في هدي خير العباد / الإمام شمس الدين محمد بن بكر بن قيم الجوزية / تح: الشيخ عبد القادر الأرناؤوط والشيخ شعيب الأرناؤوط / مؤسسة الرسالة / بيروت / ١٣٩٩هـ ، مع طبعة: دار الأحياء التراث العربي / بيروت / مراجعة: طه عبد الرزاق طه .

٥٣- سلسلة الأحاديث الصحيحة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني:
المجلد الأول / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٤ / ١٩٨٥م .
المجلد الثاني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٤ / ١٩٨٥م .
المجلد الثالث / الدار السلفية للنشر/ الكويت/ ط١/ ١٩٧٩م .
المجلد الرابع / المكتبة الإسلامية / عمان / ط١ / ١٩٨٣م .
المجلد الخامس / مكتبة المعارف / الرياض / ط١ / ١٩٩١م .
المجلد السادس / مكتبة المعارف / الرياض /ط١ / ١٩٩٥م .
٥٤- سلسة الأحاديث الضعيفة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني:
المجلد الثاني/المكتب الإسلامي / بيروت / ط١ / ١٣٩٩هـ .
المجلد الثالث / مكتبة المعارف / الرياض / ط٢ / ١٩٨٨م.
المجلد الرابع / مكتبة المعارف / الرياض / ط١ / ١٩٨٨م .
٥٥- السنة / الإمام إبن أبي عاصم / تح: الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط١ / ١٩٨٠م .
٥٦- سنن أبي داود / الإمام أبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني / تح: محمد محي الدين عبد الحميد / دار الأحياء التراث الإسلامي / بيروت .
٥٧- سنن إبن ماجة / محمد بن يزيد بن ماجة القزويني / تح: محمد فؤاد عبد الباقي / دار الجيل / بيروت
٥٨- سنن الترمذي / يحيى بن محمد بن عيسى الترمذي / تح: أحمد شاكر / وإبراهيم عطوة / محمد فؤاد عبد الباقي / دار الأحياء التراث العربي / بيروت .
٥٩- سنن الدار القطني / الإمام علي بن عمر الدار القطني / مع التعليق المغني / مكتبة المثنى / القاهرة، مع طبعة دار الكتب العلمية / بيروت / بتح و تخريج: مجدي بن منصور بن سيد / ط١ / ١٤١٧ هـ .
٦٠- سنن الدارمي / أبو محمد عبد الله بن عبد الرحمن الدارمي / تح: الشيخ محمد أحمد الدهقان / دار إحياء السنة النبوية .

٦١- سنن سعيد بن منصور / الإمام سعيد بن منصور الخراساني / تح: حبيب الرحمن الأعظمي/ دار الكتب العلمية / بيروت / ١٩٨٥م .

٦٢- السنن الصغرى / الإمام أحمد بن حسين البيهقي / تح: بهجت يوسف محمد / طبعة (وزارة الأوقاف العراقية) سلسلة احياء التراث الأسلامي .

٦٣- السنن الكبرى / الإمام أحمد بن حسين البيهقي / ط١ / ١٣٥٢هـ / حيدر آباد / الدكن.

٦٤- السنن الكبرى / الإمام أحمد بن شعيب النسائي / تح: د.عبدالغفار البزاري، سيد كسروي / ط١/ دار الكتب العلمية / بيروت /١٩٩١م.

٦٥- سنن النسائي / أحمد بن شعيب النسائي / دار الكتاب العربي / بيروت/ ط١ / ١٩٣٠م .

٦٦- السنن الواردة في الفتن وغوائلها / الإمام أبي عمر وعثمان بن سعيد الداني / تح: رضاء الله بن محمدالمباركفوري / دار العاصمة الرياض / ط١ / ١٩٩٥م .

٦٧- سير أعلام النبلاء / الإمام محمد بن أحمد بن عثمان الذهبي / تح: محب الدين أبي السعيد الغمراوي / ط١ / ١٩٩٧م / دار الفكر / بيروت .

٦٨- سير السلف الصالحين / الحافظ ابو القاسم الأصبهاني / تح: د. كرم بن حلمي بن فرحات/ دار الراية / الرياض / ط١ / ١٤٢٠هـ.

٦٩- السيرة / الإمام محمد بن أحمد بن عثمان الذهبي / عمر عبد السلام التدمري / دار الكتاب العربي / بيروت / ١٤٠٧ هـ .

٧٠- السيرة النبوية / الحافظ عماد الدين إبن كثير / تح: مصطفى عبد الواحد / دار الرائد العربي / بيروت / ط ٣ / ١٩٨٧ م .

٧١- السيرة النبوية / أبي محمد عبد بن هشام / تح: محمد محي الدين عبد الحميد / دار الفكر / بيروت، مع طبعة: مكتبة العبيكان / الرياض / بتح : عادل احمد عبد الموجود، علي محمد عوض /ط ١ /١٤١٨ هـ.

٧٢- السيرة النبوية / الأمام محمد بن اسحاق بن يسار المطلبي / تح: حميدالله خلف / معهد الدراسات و الأبحاث / الرباط / ١٣٩٦ هـ .

٧٣- السيرة النبوية الصحيحة / د.أكرم ضياء العمري / مركز بحوث السنة والسيرة / قطر .

٧٤- السيرة النبوية دروسٌ و عِبرٌ / د. مصطفى السباعي / المكتبة الإسلامية / بيروت - لبنان / ط٩ / ١٩٨٦م .
٧٥- شرح اعتقاد أصول أهل السنة والجماعة / الإمام أبي القاسم هبة الله أبي الحسن الطبري اللالكائي / تح: د.أحمد بن سعيد حمد الغامدي / دار الطيبة للنشر / الرياض / ط٥ / ١٤١٨هـ .
٧٦- شرح السنة / الإمام حسين بن مسعود البغوي / تح: الشيخ شعيب الأرنؤوط والأستاذ زهير شاويس / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٢ / ١٩٨٣م .
٧٧- شرح المواهب اللدنية / الأمام الزرقاني / طبعة مصر .
٧٨- شرح معاني الأثار / الأمام ابي جعفر الطحاوي / تح: محمد زهري النجار / دار الكتب العلمية / بيروت/ ط ٢/ ١٤٠٧ هـ .
٧٩- الشريعة / أبي بكر محمد بن الحسين الأجري البغدادي / تح: محمد حامد الفقى / مطبعة السنة المحمدية / ١٩٥٠م ، مع طبعة دار الوطن / الرياض / تح: د. عبدالله بن عمر بن سليمان / ط ٢ / ١٩٩١م.
٨٠- شعب الإيمان / الإمام أحمد بن حسين البيهقي / تح: محمد السعيد زغلول / دار الكتب العلمية / بيروت / ١٤١٠هـ .
٨١- شفاء العليل / الإمام شمس الدين محمد بن أبي بكر إبن القيم الجوزية / تح: خالد عبد اللطيف العلمي / دار الكتاب العربي / بيروت / ط٣ / ١٤١٨هـ .
٨٢- الشفاء بتعريف حقوق المصطفى / القاضي أبي عقيل عياض بن موسى / تح:محمد العلاوي /ط١/ ١٤٢٣هـ.
٨٣- الشمائل المحمدية / يحيى بن محمد بن عيسى الترمذي / دار الكتب العلمية / بيروت .
٨٤- صحيح ابن خزيمة / الإمام محمد بن إسحاق بن خزيمة / تح: الدكتور محمد مصطفى الأعظمي / المكتب الإسلامي / بيروت / ط١ / ١٩٧٢م .
٨٥- صحيح ابن حبان بترتيب إبن بلبان الفارسي/ تح: الشيخ شعيب الأرناوؤط / مؤسسة الرسالة / بيروت / ط٢ / ١٩٩٣م

٨٦- صحيح الأدب المفرد / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / دار الصديق للنشر والتوزيع / عمان / ط١ / ١٩٩٤م.

٨٧- صحيح البخاري / الإمام محمد بن إسماعيل البخاري / المطبعة السلفية /ط٢/١٤٠٧ هـ .

٨٨- صحيح الترغيب والترهيب / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي/ بيروت/ ط١ / ١٤٠٢ هـ . مع طبعة مكتبة المعارف / الرياض /ط١ /٢٠٠٠م.

٨٩- صحيح الجامع الصغير وزيادته / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٢/ ١٩٨٦م .

٩٠- صحيح السيرة النبوية / إبراهيم العلي / مراجعة: د.همام سعيد / دار النفائس / عمان / ط٢/ ١٩٩٦م .

٩١- صحيح السيرة النبوية / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتبة الإسلامية /عمان /ط١ / ١٤٢١هـ.

٩٢- صحيح سنن إبن ماجة / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتبة التربية العربي / ط١ – ١٩٨٦م .

٩٣- صحيح الكلم الطيب / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني/ المكتب الإسلامي / بيروت/ ط١ / ١٩٨٤م.

٩٤- صحيح الفقيه و المتفقه / الخطيب البغدادي / اختصار و تح: عادل بن يوسف العزازي / دار الوطن / الرياض / ط١ / ١٤١٨ هـ .

٩٥- الصحيح المسند مماليس في الصحيحين / الشيخ مقبل بن هادي الوادعي / مكتبة دار القدس / صنعاء / ط١ /١٩٩٦م .

٩٦- الصحيح المسند من أسباب النزول / الشيخ مقبل بن هادي الوادعي / مكتبة دار القدس / صنعاء / ط١ / ١٩٩٣م .

٩٧- الصحيح المسند من فضائل الصحابة /مصطفى بن العدوي/دار ابن عفان /السعودية / ط/١٩٩٩م.

٩٨- صحيح سنن أبي داود / الشيخ محمد ناصرالدين الألباني / مكتب التربية العربي / ط١ / ١٩٨٨م .

٩٩- صحيح سنن الترمذي / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتب التربية العربي / مع طبعة دار المعارف / الرياض/ ط١ / ١٩٨٧ م ،.

١٠٠- صحيح سنن النسائي / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتبة التربية العربي/ ط١ / ١٩٨٨م .

١٠١- صحيح مسلم / الإمام مسلم بن الحجاج القشيري/ تح: محمد فؤاد عبد الباقي/ دار أحياء الكتب العلمية / بيروت / ط١ / ١٣٧٤هـ

١٠٢- ضعيف الأدب المفرد / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / دار الصديق للنشر والتوزيع / عمان / ط١ / ١٩٩٤م.

١٠٣- ضعيف الجامع الصغير وزيادته / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / المكتب الإسلامي / بيروت / ط٢ / ١٩٨٦م .

١٠٤- ضعيف سنن أبي داود / الشيخ محمد ناصر الدين الالباني / مكتبة التربية العربي/ ط١ / ١٩٨٨م، مع طبعة / المكتب الإسلامي / بيروت / ط١ / ١٤١٢هـ

١٠٥- ضعيف سنن الترمذي / الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتبة المعارف / الرياض / ط١/ ١٤٢٠هـ، مع طبعة مكتبة المعارف / الرياض / ط١ / ١٤٢٠ هـ

١٠٦- ضعيف سنن إبن ماجة / الشيخ محمد ناصرالدين الألباني / مكتبة المعارف / الرياض /ط١ / ١٤١٧هـ، مع طبعة مكتبة المعارف / الرياض / ط١ / ١٤١٧ هـ

١٠٧- ضعيف سنن النسائي/ الشيخ محمد ناصر الدين الألباني / مكتبة التربية العربي / ط١ / ١٤١١هـ.

١٠٨- الطبقات الكبرى / الأمام محمد بن سعد / تح: زياد محمد / مكتبة العلوم و الحكم / المدينة / ط٢ / ١٤٠٨ هـ .

١٠٩- العلل المتناهية في الأحاديث الواهية / الإمام أبو الفرج عبد الرحمن إبن الجوزي / تقديم الشيخ خليل الميس / دار الكتب العلمية / بيروت / ط١ / ١٩٨٣م .

١١٠- عمل اليوم والليلة / أحمد بن شعيب النسائي / تح: الدكتور فاروق حمادة /مؤسسة الرسالة / ١٤٠٦هـ.

١١١- عيون الأثر / محمد بن محمد بن سيد الناس / الحلبي و شركائه / القاهرة / ١٣٥٦هـ .

